# پێڕست

# بەناوی خوا

سوپاس بۆ خوا کە دەرفەتی ئەوەی پێدام، لەهەوڵێکی دی وشیاری دینیدا بێمەوە خزمەتتان.

سەرەتای ئاشنابونم بە بەرهەمەکانی مامۆستاوە، دەتوانم بڵێم لەپاش ئاشنایی پەیدا کردنم بوو لەگەڵ وتارەکانی مامۆستا ناصری سوبحانیدا، کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵانی (٢٠٠٣-٢٠٠٤)ز. ئەوەبوو پاش کۆکردنەوەی زۆرێك لەبەرهەمەکانی مامۆستا ناصر کە نهێنیانە بلاّو دەکرایەوە، لەگەڵ هاوڕێیەکم دەستمان کردە نوسینەوەی وتارەکانی مامۆستا، یەکەم هەڵبژاردەشمان وتارەکانی بەندایەتی بوو، چونکە لەلایەك تاڕادەیەك دەنگەکەی جوان تۆمارکرابوو، لەلایەکیش بە زمانێکی سادەتر ئەدوا. پاش ئەوەی نزیك بە چەند مانگ سەرقاڵ بوین بەنوسینەوەی وتارەکانەوە، بەلاّم ئەوەبوو دەزگای بەرهەم بۆ بلاّوکردنەوەی بەرهەمەکانی سوبحانی بەدیارکەوت و یەکەم کاریشیان بریتی بوو لە بلاّوکردنەوەی کتێبی (بەندایەتی)، کە ئەوکاتە ئێمە لە کاسێتی ژمارە (١١) بوین، بەداخەوە قسمەتی ئێمە نەبوو کە ئەو کارە ئەنجام بدەین. پاشان ئەوەبوو لەگەڵ چەند هاوفیکری خۆمدا سەنتەرێکی ڕەمزیمان دانا بەناوی (ئاتنا) بۆ بلاّوکردنەوەی بەرهەمەکانمان، لەو کارانەی کردمان بریتی لە بلاّوکردنەوەی وتارەکان، بەتایبەتی کە لەساڵانی (٢٠٠٥-٢٠٠٦)ز ئینتەرنێت بەم شێوازە بەربلاّوەی ئێستا نەبوو، خەڵکی نەیدەتوانی ئەو بەرهەمانە دەست بخات، هەربۆیە لەڕێگای سەنتەر و کتێبخانە گەڕۆکەکانەوە گەیاندمانە زۆرێك لەناوچەکانی وەکو

(دەربەندیخان و کفری و کەلار و سەیدسادق و هەڵەبجە و ..)، جا لەنێو ئەو بەرهەمانەشدا بەشێکی تایبەتمان بوو بە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی مامۆستا ناصر و کاك ئەحمەدی موفتی زادە. سەرەتا ئەوەبوو کاری چاککردنی دەنگەکانمان کرد کە زۆرێکیان دەنگەکانیان باش نەبوو، پاشان بۆ ئەوەی لە سیدیەکدا زۆرترین وتار لەخۆبگرێت، بەرهەمەکانی مامۆستا ناصرمان کردە سێ سیدی کۆمپیوتەری و بەرهەمەکانی کاك ئەحمەدیش کە لە ڕێگای سایتی مەکتەب قورئانەوە وەرمان گرتبوو، بەڵام بەشێکی کەم بوو لە وتارەکانی کردمانە سیدیەکی دی. پاشان ئەوەبوو لە ئێرانەوە لە ڕێگای مامۆستایەکەوە سەرجەم وتارەکانی مامۆستا ئەحمەدمان چنگ کەوت کە خۆی لە ١٤سیدیدا ئەبینیەوە، لە ڕێگای بەرنامەوە کردمانە یەك دیڤیدی، بەهەمان شێوە وتارەکانی مامۆستا ناصریش زیاد ببوو، بۆیە بۆ ئەوەی کۆبێتەوە، هەمویان لە یەك دیڤیدیدا جێکردەوە، لەگەڵ نوسینی ناوی سەرجەم بابەت و وتارەکان، تاوەکو ئاشانکاری بێت بۆ کەسی گوێگر و بەم جۆرە بڵاومان کردەوە، لەگەڵ کۆکردنەوەی سەرجەم وتارە ڤیدۆییەکانی کاك ئەحمەددا کە بە دوو دیڤیدی بڵاومان کردەوە. هۆکاری ئەم کارەشمان تەنها بڵاوکردنەوەی وشیاری دینی و خزمەت بووە بەم دینە پاکە و بۆ لایەنی مادی ئەم کارەمان نەکردووە، بەڵکو هەمیشە ئەو کەسەی گوێگری وتارەکانی مامۆستا ئەحمەد و کاك ناصر بێت، جۆرە گروتینێکی ئیمانیانەی بۆ دروست ئەبێ کە حەز بە زیاتر بڵاوکردنەوە و ئاشناکردنی خەڵکی بە بەرهەمەکانیان دەکات، وا هەست ئەکەم هەر ئەمەش بوو کە

سوپاس بۆ خوا لە ماوەیەکی زۆر کەمدا گەنجانێکی زۆر ئاشنا بون بە بەرهەمەکانیان.

ئەم بەرهەمەی ئێستاش لەبەر دەستدایە هەوڵێکی دەستەجەمعیە، کە پاش ڕاگەیاندنی ئەوەی کارێکی لەم جۆرە بکەین، ئەم خوشکانە هەریەکە و بەپێی کاتی خۆی نوسینەوەی بەشێك لەوتارەکانی گرتە ئەستۆ، ئەوانیش ئەم بەڕێزانە بون:

١. ماجیدە مەعروف

٢. سایە فارس

٣. سەرچین نوری

٤. سارا عەلی

٥. سارا جەلال

٦. چرۆ نوری

٧. ئاسیا ئەحمەد

٨. خەندان نەجمەدین

٩. شەپۆل حمە ئەمین

کە سەرجەمیان خۆی لە حەوت کاتژمێردا ئەبینێتەوە. پاش ئەوەی نوسرانەوە، بەگوێرەی توانایی خۆم پێداچونەوەم کردووە و دوبارە هەموو کاتژمێرەکانم گوێ لێگرتۆتەوە و زمانەکەیم بەپێی شێوە زاری خۆمان لێکردووە، تاوەکو خوێنەر ئەوەندە ماندوو نەبێت بە وشەی فارسی و سنەییەوە، هەندێ کاتیش بۆ جوانی دەربڕینەکان شێوە زارەکەی خۆیم هێشتۆتەوە، بەو هیوایەی جێ ڕەزامەندی خوا و ئێوە بێت.

سەبارەت بە ئەم بەرهەمە کە لەژێر ناوی (پەرستش)دایە، کۆکراوەی ئەو وتارانەی مامۆستایە کە لەو بوارەدا تۆماری کردون، ئەوانیش (حیکمەتی دەستنوێژ و نوێژ و ڕۆژوو، حیکمەتی نوێژی جەماعەت، قەسرو جەمعی نوێژ، زەکات، تەیەموم، زیارەتی کەعبە، پرسیار و وەڵامەکانی دەربارەی پەرستش).

# سەرنجێك لەبارەی شوراوە

لێرەدا بەدەرفەتی ئەزانم سەرنجێکی خۆم لەسەر لایەنێکی بیرکردنەوەی مامۆستا دەربېڕم، کە ئەویش مەسەلەی شورا و خیلافەتی ئیسلامیە، کە زۆرجار لە وتارەکانیاندا چ کاك ئەحمەد چ مامۆستا ناصر ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە خیلافەت لە پاش ئیمام عەلی خیلافەت بێت، چونکە شورایان لەبەین بردووە. یاخود هەندێ تێگەیشتنیان هەیە بۆ مەرجی ئەندامانی شورا و دەسەڵاتداری حاکم کە بۆ دەسەڵاتداریەتیەکی گەورەی وەکو ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی ناشێت. لێرە بە کورتی هەندێ لەو سەرنجانە دەخەمە ڕوو بەو هیوایەی نەبێتە بارگرانی بۆتان.

یەکێ لەو شتانەی کاك ئەحمەد باسی لێوە دەکات ئەوەیە کە دەسەڵاتەکەی معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان پشتاوپشتی و پاشایەتی بوو، لەکاتێکدا معاویە هەر لە دەورانی ئیمامی عەلیەوە بووە ئەمیری شام و میسر و دواتریش ئیمامی حەسەن ناوچەکانی تری لە پاش باوکی پێدایەوە. پاشانیش کە بەیعەتی بۆ کوڕەکەی یەزید وەرگرت، بەپێی بەیعەتێك بوو کە تێکڕای گەورە زانایان لەسەری کۆك بون، چەند کەسێك نەبێت، وەئەگەر نا بە تێکڕایی دەنگیاندا بە یەزید، هاوشێوەی هەڵبژاردنەکانی خەلیفەکانی ڕاشیدین کە سەرەتا لەسەر ئاستی تاك بوو، عومەر ئەبوبەکری هەڵبژارد، پاشان ئەبوبەکر عومەری هەڵبژارد، ئینجا لەنێوان عوسمان و عەلیدا عوسمان و پاشانیش عەلی هەڵبژێردرا، کە هەمویان ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ مێژووی هەڵبژاردنیان لەسەر ئاستی تاك بووە و پاشان بۆتە بەیعەتی گشتی. بەڵام ئەوەی بەکێشە دائەنرێ ئەوەیە

که هەریەکە لەو خەلیفانە بەیعەتیان بە کوڕی خۆیان نەداوە، ئەگەرچی سەرەتا کوڕ هاتنە جێی باوك لەلایەن ئیمامی عەلیەوە بوو کە پاش شەهیدبونی کوڕەکەی ئیمام حەسەن کرایە جێنشین، بەلاّم هیچکات ئیمام عەلی لەژیانیدا بەیعەتی بۆ کوڕی وەرنەگرتووە، ئەمەش بۆ دوو خالّ ئەگەڕێتەوە، یەکەم ئیمام عەلی شەهید کرا و ئەو دەرفەتەی نەبوو تاوەکو جێنشین دیاری بکات وەکو ئەبوبەکر و عومەر کردیان، پاشانیش ئەگەر زیندوو بوایە لەبەر زۆری گڕ سەندنی فیتنە دەیتوانی کەسێك هەلّبژێرێ؟! لەکاتێکدا خۆی بەهەلّبژاردنەکەی دلّگران بوو چونکە ئەوەندە ئوممەت لە تاو و گڕی فیتنەوە نزیك بوو.

بۆ ئەوەی باسەکە جوانتر ئامانجەکەی بپێکێ، مەبەستمە بلّێم شێوازی شورا لە دەورانی ڕاشیدین جیاواز بووە لە خودی دەورانی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم)، شورای دەورانی ئەبوبەکر جیاواز بووە لەوەی پاش خۆی، وە هەر یەکە لە ئەوانی تریش تەماشا بکەی بە پێی ئیجتهاد و تێگەیشتنی خۆیان بۆ شورا ئەو کارەیان ئەنجام داوە، بۆ نمونە لێدانی هەلّگەڕانەوەکان کاری یەکلاکەرەوەی خەلیفە ئەبوبەکر بوو نەك پەسەندی تێکڕای هاوەلاّن، لەکارلابردن و دورخستنەوەی والیەکان لەدەورانی عومەر و لێپێچینەوەیان لەلایەن خەلیفەوە دەکرا نەك شورا، لەکاتی گەمارۆدانی خەلیفە عوسماندا زۆرینەی هاوەلاّن لەگەلّ ئەوەدا بون ڕوبەڕوی ئەو هێزە ببنەوە، بەلاّم خەلیفە عوسمان پەسەندی نەکرد و هەلّوەشایەوە، یاخود ئیمامی عەلی سەندنەوەی خوێنی خەلیفە عوسمان دوان لە دەستەی شورا کە تەلّحە و زوبێر بون تا ئاستی

جەنگانیش دژی بوون. لەبەر ئەوە پێم وایە ئەم جۆرە لەتێڕوانین و جیاکردنەوە هەڵەیە کە شورا تەنها لە دەورانی خەلیفەکانی ڕاشیدین کاری پێکرا و دوای ئەوە نەما، بەڵکو من پێم وایە ئەوە دابەشکردنی ئیدارەی سەرزەمینی ئیسلامی بوو بۆ ویلایەت و ئیمارەت و سەربەخۆیی وەرگرتنی ناوچەکان بوو لە ڕووی بەڕێوەبردن و دادوەریەوە و پابەندیان بە خیلافەتەوە نەك نەمانی شورا، ئەگینا دەسەڵاتێکی گەورە و بەهێزی وەکو ئەمەوی و عەباسی و .... چۆن بەتەنها پاشایەك بەڕێوە دەبرێ؟!

ئەمەوێ بڵێم ئەوەی لە مێژووی ئیسلامیدا گوزەریاوە هەروا سادە و ئاسان تەعبیر نەکرێ و نیشانەی ڕاست و چەپی بەسەردا نەدرێ، کاتێ ئەو سیستمە باش بوو کە خیلافەت لە چوارچێوەی نیمچە دورگەی عەرەبیدا بوو، کاتێ بەرفراوان بوو ناوچەکانی عێراق و ئێران و شام و میسری تێکەوت، وردە وردە بەری فیتنە نەئەگیرا، ئەو شورایەی تۆ دروستت کردووە لە نیمچە دورگەدا ئایا ناوچەکانی تر قبوڵیانە؟ هەربۆیە دەبینین خوێن حەلاڵکردنی خەلیفەکان لەلایەن ناوچە ئازادکراوەکانەوە ئەنجام ئەدرێ، بەهۆی پابەند نەبون و باش حاڵی نەبونی ئوممەتەوە لەبەرامبەر خیلافەت و سەمع و تاعەت بۆ کردنی. بۆیە من ئەڵێم ئەو جۆرە لە چاکسازی بۆ ئەو سەردەمە لەلایەن معاویەوە جۆرێکی تر بووە لە ئیجتهاد نەك لادان، بەپێی خوێندنەوەیەکی قوڵی بۆ حاڵەت و بارودۆخەکان بەو ئەنجامە گەیشتووە و تێگەیشتووە کە خەڵکەکە فێری ئەو جۆرە سیستمەن و پێویستە بۆ ڕونەدانی فیتنەو ئاژاوەی زیاتر ئەم جۆرە لە ئیجتهادی دەسەڵات ئەنجام بدات. کاتێکیش تەماشای مێژووی موسڵمانان ئەکەین دەبینین ئەو جۆرە سیستمە باشتر جێگەی گرت و لەلایەن

کەمینەیەکی کەمەوە بەرهەڵستی کرا، ناڵێم باشتر بوو بەلاّم پێم وایە بۆ ئەو سەردەم گونجاو بوو، چۆن ئێستا سەردەمی پشتاوپشتی وەکو شتێکی عەنتیکە تەماشا ئەکرێ و دیموکراسی باوە، ئەو کاتیش ئەگەر دەسەلاّتی ئیسلامی بەو زوییە بەرفراوان نەکرایە ئەکرا ئەو سیستمەی ڕاشیدین پەیڕەویان لێکرد پێی داکوتیایە، بەو جۆرەی زوو فراوان بوو لای عامی خەڵکی شتێکی نەناسراو بوو جێگای ڕەزامەندی نەبوو، بەڵگەشمان ئەوەیە لەتەواوی مێژووی موسڵمانانداا تاکە کەسێك هەوڵی گەڕاندنەوەی ئەو جۆرە لە سیستمی دابێت عەبدوڵلاّی کوڕی زوبێرە، کەچی دەبینین زۆرێك لە دەسەلاّتەکان بەدەستی خۆی و خزمەکانیەوە بون، ئیتر ئایا لەبەر بارودۆخەکە بووە یاخود نا ئەوە ئێمە نازانین. هەرچی هەوڵەکەی ئیمام حسێنیشە بەڵێ کارەکەی ئەو بۆ گەڕاندنەوەی ئەو سیستمە بوو بەلاّم ئەوانەی لەدەوری بون خزمەکانی بون، ئەوانەیشی نامەیان بۆ نارد و بەڵێنی هاوکارییاندا لەبەر تێگەیشتنیان نەبوو لەو سیستمە بەڵکو لەبەر خۆشویستنی ئالوبەیت بوو، چونکە ئەبینین کە تەواوی ئەو دەسەلاّتانەی لەمێژودا بەناوی ئالوبەیتەوە دەرکەوتون سیستمێکی پشتاوپشتی بون، چونکە هەر خودی ناوەکە خۆی مانای پشتاوپشتی دەگەیەنێت، جگە لەمەش بەدرێژای مێژووی موسڵمانان چ سیستمی وڵات چ فیرقە و گروپ و مەزهەبەکان توشی هەمان جۆر لەو پابەندی بە ڕەچەڵەك و بنەڕەتەوە بووە، تەنانەت میرایەتی و شێخایەتیەکەی لای خۆشمان هەر درێژکراوەی ئەو بیرەیە. بۆیە لە کۆتایدا هەمدیسان دوبارەی ئەوە ئەکەمەوە مەبەستم لەم بەدیارخستنە بۆ زیاتر

قوڵبونەوەی ڕۆشنبیرانی ئیسلامیە لە ئاست ڕوداوە مێژوییەکان، تاوەکو لەو گێژاوە دەربێن موقەدەسی بدەنە پاڵ سەردەمێك و زەربیش بێنن بەسەر باقیەکەی تردا، ئەمە درێژکراوەی هەمان ئەو بیرەی ئەبوئەعلای مەودودیە لە کتێبی (خیلافەت و پاشایەتی)، کە سەردەمی پاشایەتی هەموو بەسەردەمی گەڕانەوە بۆ جاهیلیەت نیشان ئەدات، لەکاتێکدا زۆرینەی زانستە ئیسلامیەکان و پەرەدان بەزانستە جۆراوجۆرە عەقلانیەکان هەموی لەدەورانی دوای خیلافەتی ڕاشیدینەوە بوو، ناکرێ هەر بەو سادەیی و ڕۆشنیە تاریك بکرێت و هاوشێوەی ئەوروپا بە سەردەمی تاریکی ناوی بەرین، تەنها لەبەر ئەوەی ئیمامی حوسەینی تیا شەهید کرا، کە بەڵێ زوڵمێکی گەورە بوو، بەڵام تاوانی لایەنگرانی و توشکردنی بۆ هاتن بۆ کەربەلا و پشت لێ هەڵکردنی کەمتر نەبوو لە شەهید کردنەکەی، ئەی خۆ دەورانی ڕاشیدین سێ هاوەڵ و خەلیفەی ئیسلام شەهید کران! بۆیە ئەڵێم ئەگەر سیستمی ڕاشیدین هاوشێوەی ئەمریکا چۆن تاوەکو میللەت و ناوچەکەی بەو سیستمە سیاسیە ڕانەهێنا کە دیموکراسی بوو، کرانەوەی نەبوو بەڕوی دونیادا، بەهەمان شێوە ئەگەر خەلیفەکانی ڕاشیدینیش ئەوەیان ببوایە دەیانتوانی سەرکەوتوو بن.

تێکەڵکاریەکی تری ئەم بوارە ئەوەیە کە ئیمامەکان و دەسەڵاتدارانی خیلافەت بە دوو بەرەی دژ بەیەك پێناسە دەکەن، لە کاتێکدا وانیە، زۆرێك لە ئیمام و زانایان پاڵپشتی دەسەڵاتداران بون و هاوکاری یەکتری بون و پێشەنگانی ئەم ئوممەتە بە مامۆستایان و زانایان ڕازابۆوە، بەهۆی پاڵپشتی زۆرینەی خەلیفانی دەوڵەتەوە، کەسێکی وەکو ئیمام ئەبوحەنیفە

لەبەر ئەوە دژایەتی دەسەڵاتی نەکردووە کە سیستمی ڕاشیدین بگێڕێتەوە، بەڵکو شەڕی ئالوبەیتی کردووە، بە هەمان شێوە کەسێکی وەکو ئیمام شافیعی، هەرچەندە پاش دانیشتنی لەگەڵ خەلیفە هارون ڕەشید لەو تێڕوانینەی پاشگەزبۆتەوە، ئەگەر خیلافەتی ئەمەوی یان بەنی عەباس جاهیلیانە بوو لەبەرچی قوتابیانی زۆرێك لە ئیمامەکان تێیدا بونە قازی قوزات! بۆیە ئەگەر وردتر بیر بکەینەوە، دەبینین کە ئەبوبەکر و عومەر و ... ئەگەر ماوەیەکەیان کەمێك درێژتر بوایە و شەهید نەکرانایە، ئەمە هەڵبەتە وەکو نمونە ئەڵێم، باشە لە پاش ئەوە کێ هەڵبژێردرایە؟ ئایا مەسەلەی هەڵبژاردنیش هاوشێوەی ئەو فیتنەیەی بوو نەئەبووە فیتنەیەکی فراوانتر؟ هەربۆیە ئەم بابەتە ئەگەر بمانەوێت هەڵوێستەی لەسەر بکەین زۆر درێژە ئەکێشێت، بەڵام وەکو بەرچاو ڕونیەك بۆ کەسی خوێنەر کە ئەم تێڕوانینەشی هەبێت. لە هەمان کاتدا ئەگەر هەڵسەنگاندنێکیش بکەین بۆ حاڵی ئەو کاتی ئێران و بەتایبەتی ئەهلی سوننە لەپاش ڕوخانی شاوە، ئاساییە بۆ لێك نزیکبونەوەی شیعە و سوننە لەیەك، وەها بیرکردنەوەیەکیان بوبێت، یاخود خەونبینین بەدروستکردنی جیهانی یۆتۆپیایی کە زۆرێك لە ڕوناکبیرانی سەرقاڵکرد بوو، بەوەی نەخشەی کاری خۆیان بخەنە ڕوو، هەربۆیە ئەهلی سوننەش جوانترین نمونەی شورایان ئیختیار کرد کە دەورانی خەلیفە عومەرە، بەڵام بە مەرام نەگەیشتن و نەبووە قیسمەت.

له کۆتایدا بەهیوام بە وتەکانم بێزارم نەکردبن، بەو هیوایەی چێژ لە خوێندنەوەی کتێبەکە ببینن و دڵ و ڕۆحتانی ئاوێزان بکەن، تاوەکو دنیایەکی ڕوناکتر و ئاسۆیەکی گەشتر لەبەر چاوتان بکرێتەوە.

ئامادەکار/جهاد خاوەری

شەوی ٢٠١٧/١/١١ کانی با/سلێمانی

## کورتەیەك لە ژیانی مامۆستا مەلا ئەحمەدی موفتی زادە

★ ناوی ئەحمەدی کوڕی مەلا مەحمودی موفتی کوڕی مەلا عەبدوڵلآ کوڕی مەلا مەحمودی دشەیی، لە ساڵی (١٣١٢ك.هـ/١٩٣٣ز)، لە(سنە) لەدایك بووە. لە تەمەنی منداڵیدا لای باوکی فێری خوێندەواری بووەو تێکەڵی فەقێکانی کردووە لە مزگەوتی (دارالإحسان)، هەر لەتەمەنی هەرزەکاریدا کەسایەتییەکی هەستیار بووەو زۆر بەزەیی بەچینی هەژاران و چەوساواندا هاتۆتەوە، تەنانەت باس لەوە دەکرێت کە ئاژەڵانی برسیشی تێر کردووە. لەماوەی ژیانیدا مامۆستا دوو جار ژیانی خێزانی پێکەوە ناوە، جاری یەکەم لەسەردەمی فەقێییدا بوو، کە خاتونێکی خواست بەناوی (حەسیبە خانم) خوشکەزای دایکی مامۆستا بوو، بەڵام بەهۆی سەرقاڵی مامۆستا بە خوێندنەوە و تێنەگەیشتن و جیاوازیان بۆ ژیانی خێزانی، هەربۆیە لەیەکتر جیابونەتەوە. جاری دووەمیش (خەدیجە خانم) دەخوازێت، کە کچی حاجی (ڕەحمانی موهتەدی)یە، بەرهەمی ئەم ژیانەشیان کوڕێکە بەناوی (حەمە ژیان)، دوای عومرێك پێکەوە ژیان خاتوو خەدیجە لەساڵی (١٣٥٠ك.هـ/ ١٩٧١ز) کۆچی دوایی دەکات و لەپاش ئەوەش ئیتر مامۆستا ژن ناهێنێتەوە. هەروەها لە ماوەی ژیانیدا یەکجار زیارەتی کەعبەی کردووە، لەساڵانی حەفتەکاندا بووە، کە مامۆستا لە باسی زیارەتی کەعبەدا بۆ خۆی ئاماژە بەو حەجەی دەکات.

★ مامۆستا لەسەرەتای پەنجاکاندا بۆ خوێندن ڕوی کردە کوردستانی عێراق و گەیشت بە خزمەتی هەندێ لە زانایان، لەوانەش دکتۆر (مستەفا زەڵمی) کە ئەو کاتە مەلا بوو لە مزگەوتی (بن تەبەق)ی

سلێمانی و مامۆستا ماوەیەك لەلای دەرسی خوێندووە، پاشان چۆتە گوندی عەبابەیلێ لە هەڵەبجە و لەوێش ماوەیەك ماوەتەوە. لەم ماوەیەدا سەردانی مامۆستا و زانایانی ناوچەکانی تەوێڵە و بیارەشی کردووە و ماوەیەك لە خزمەت وانەکانی (مەلا عەبدولکەریمی مودەریس)دا بووە. بەهۆی ئەو زیرەکی و زمان پاراویەوە ماوەیەك لە گوندەکانی کوردستانی عێراق دەبێتە مەلا و وتار دەدات، بەڵام دواجار لەلایەن باوکیەوە نامەیەکی بۆ دەنێرێت و داوای گەڕانەوەی دەکات کە زۆر تاسەی بینینی دەکەن، هەربۆیە مامۆستا دەگەڕێتەوە بۆ سنە. پاشان گەڕانەوەی بۆ شاری (سنە)و لەسەر دەستی باوکی ئیجازەی فتوادان وەردەگرێت، کەتەمەنی لە(٢٥) ساڵ کەمتر دەبێت.

⋆ مامۆستا پاش ئەوەی ماوەیەك لە جێگەی باوکی دەرسی فەقێکان ئەڵێتەوە، دواتر سنە بەجێ دیلێت و دەچێتە تاران و لەوێ ماوەیەك لە زانکۆی تاران لەبەشی فەلسەفە و زانستە ئیسلامیەکان وانەی مەزهەبی (شافیعی) ئەڵێتەوە. پاشان هەر لەو ماوەدا، لە ساڵی (١٣٣٧ ك.هـ/ ١٩٥٨ز) لە ڕادیۆی تاران بەشی کوردی شیعری خوێندۆتەوە و مەتاڵبە نەتەوەیی و کوردیەکانی گەیاندووە، لەهەمان کاتدا لەگەڵ هەندێ لە کوردەکانی ئەوێ ڕۆژنامەیەك دەردەکەن بەناوی (کوردستان) و دەبێتە یەکێ لەدەستەی نوسەرانی ڕۆژنامەکە. هەرلەهەمان ساڵدا پەیوەندی دەکات بە حزبی دیموکراتەوە و بەهۆی چالاکیەکانی لەو پارتەدا دەبێتە بەڕێوەبەری کۆمیتەی حزبەکە لە تاران. کاروچالاکیە نەتەوەییەکانی لەناو ئەم پارتەدا درێژە پێدا تا ئەو کاتەی لەلایەن دەزگای ساواکی سەر بە

دەسەڵاتی شاهەنشای ئێران لەساڵی (١٣٤٢ك.هـ/١٩٦٣ز) خۆی و چەند ئەندامێکی پارتەکە دەسگیرکران و کرانە زیندانی (ئەوین) لە تاران. بەهۆی سوربونی لەسەر نەدرکاندنی نهێنی حزبەکە، لەلایەن دەزگای ساواکەوە زۆر بە سەختی سزا درا، تا ئەوەی کرکراگەیەکی پشتی دەردەچێت و بەهۆی ئازاری زۆریەوە ڕەوانەی نەخۆشخانەی سوپا دەکرێت و چارەسەری بۆ دەکەن. دوای ئەوەی زیاتر لە شەش مانگ زیندانی دەکەن و بەڵام سوربونی لەسەر هیچ نەوتن، مامۆستا ئازاد دەکرێت. بەڵام ئەم زیندانە دەبێتە قوتابخانەیەکی گەورە بۆ بەخۆداچونەوە و گۆڕانکاری لە فیکری مامۆستادا، هەربۆیە پاش ئازادکردنی ئیتر مامۆستا ئەو کەسەی پێشوو نەبوو، بەڵکو ڕەوتی کاری گۆڕی بۆ شێوازی پەروەردەی ئیسلامیانە و بنکەی دەسپێکی ئەم کارەشی گواستەوە بۆ شاری سنە.

★ مامۆستا پاش بەجێهێشتنی تاران و گەڕانەوەی بۆ زێدی خۆی، دەستی دایە دروستکردنی (مەدرەسەی قورئان) لە سنە و مەریوان، کە بەهۆی زوو تەشەنەکردن و کۆبونەوەی خەڵکی لەدەوری ئەم قوتابخانەیە، وەك خۆی دەڵێت: "سەرەتا دەستم کرد بەوتنەوەی تەفسیری في الظلال، لەڕوانگەی قورئانەوە باسی کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری و فیکرییەکان دەکرا، سەرەنجام چەند قوتابخانەیەکی ترمان لەمەریوان و چەند شارێکی تر کردەوە و چەندین مامۆستا و قوتابی و ڕۆشنبیر لەدەوری کۆبونەوە". بەڵام بەهۆی دژایەتی کردنی گروپە چەپەکان کە پەلاماری بنکەیەکی ئەو قوتابخانەیاندا، لە ساڵی (١٣٥٨ك.هـ/١٩٧٩ز) لەنێو

(١٣) ئەندامدا (١١)یان شەهید کردن، مامۆستا ناچار دەبێت ڕوو بکاتە (کرماشان) هەر لەو ساڵەدا، بەڵام دوبارە قوتابخانەکەی خۆی دەست پێکردەوە لەژێر ناوی (مەکتەب قورئان).

٭ لە ساڵی (١٣٥٧ك.ھ/کۆتایی ١٩٧٨ز) کاتێك شۆڕشی ئیسلامی دەستی پێکرد بە سەرکردایەتی (خومەینی)، مامۆستاش پەیوەندی پێوە کردو هەواڵ و نامە گۆڕینەوە دەستی پێکرد، کە (خومەینی) وەك ڕابەری شیعە و مامۆستاش وەك ڕابەری سوننە بوو، بەڵام ئەم پەیوەندیە تا سەرکەوتنی شۆڕش درێژەی کێشا. مامۆستا لە ئازاری (١٩٧٩)ز نامەیەکی لە ڕۆژنامەیەکی تارانیدا بڵاوکردەوە و پێویستی دابینکردنی مافی گەلانی ئێرانی لە دەسەڵاتدارانی نوێ لەسەر ئەم بنچینانە داواکردبوو:

١. یەکسانی مافی نەتەوایەتی، فەرهەنگی، سیاسی و کۆمەڵایەتی سەرجەم نەتەوەکانی ئێران.

٢. یەکسانی سیاسی و یاسایی شیعە و سوننە لە ئێراندا.

٣. یەکسانی مافی ئابوری و کۆمەڵایەتی بۆ تێکڕای خەڵك.

٭ پاش دامەزراندنی حکومەت و بەژداری کردنی مامۆستا لەو حکومەتەدا، چەپەکان زیاتر کەوتنە دژایەتی کردنی مامۆستا و کۆمەڵەکەی، کە(٣٤) کەسیان لێ شەهید کردن، ئێستا لە گۆڕستانێکن لە سنە. بەتایبەتی لەو ڕۆژگارەدا کۆمەڵە مارکسییەکان دەسەڵاتیان هەبوو بەسەر هەندێ شارو شارۆچکەی کوردستاندا و سەرەڕای شەهید کردنی چەندین مەلا لێرە و لەوێ، چیرۆکی بێحورمەتی کردن بە مزگەوتەکان لەلایەن چەکدارانی چەپەوە بووە وێردی سەرزاری خەڵکی.

★ ساڵی (١٣٥٩ك.هـ/ ١٩٨٠ز) دوای ئامادەبونی نوێنەری ناوچەکانی ئێران، وەك (بەندەر عەباس، سیستان، بلوجستان، کوردستان،...) بە ڕابەرایەتی مامۆستا و مەولەوی عەبدولعەزیز شورای مەرکەزی ئەهلی سوننە (شمس) پێك هات، کە ئەندامانی باڵای شورا لە (٩) کەس پێکهاتبون، واتە خودی شورا (١١)کەس بون، بەڵام هیچکام لە مامۆستا و مەولەوی عەبدولعەزیز یەکێك نەبون لە ئەندامی باڵای شورا. لە تاران یەکەمین کۆبونەوەیان ئەنجامدا، دوای سێ ڕۆژ لە کۆبونەوە و گفتوگۆ کردن، لەکۆتایی کۆنفرانسەکەدا بەیاننامەیەکی ١٦خاڵیان ئاڕاستەی حکومەت کرد و تێیدا نیەت پاکی و دڵسۆزی خۆیان دوپات کردەوە، لەگەڵ جەخت کردنەوە لەسەر داواکاریەکانی ئەهلی سوننە بە گشتی و لابردنی ستەم لەسەر سەرجەم نەتەوەکان.

★ لە هاوینی ساڵی (١٣٦١ك.هـ/ ١٩٨٢ز) مامۆستا و ئەندامانی شوراکەی کۆنگرەی دووەمی خۆیان بە ئاشکرا لە کرماشان سازدا، سەرەتا مامۆستا لەسەر کۆڵنەدان و خەباتی سیاسی ڕەخنەی ئاشکرای لە سەرانی دەوڵەت و هەڵوێستیان گرت. کۆنگرە چەند ڕۆژێکی خایاند و دەوڵەت بە پیلان گێڕو گێرە شێوێن ناوزەندی کردن و بڕیاری گرتنی زاناو کەسایەتیە ناودارەکانیدا. هەربۆیە مامۆستاش سەفەری کرد بۆ تاران تا لەنزیکەوە سەرانی حکومەت تێبگەیەنێت، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك لەگرتوخانەدا توند کرا! پاش (دە) ساڵ لەزیندان، ساڵی (١٣٧١ك.هـ/١٩٩٢ز) ئازاد دەکرێ، بەڵام مامۆستا بەهۆی ئازاردانیەوە چەند ئێسکێکی پشت ملیان شکاندبوو، ئەمە جگە لەوەی توشی شێرپەنجە ببوو هیوای چاکبونەوەی نەبوو، هەربۆیە دوای ئازادکردنی تەنها ٦مانگ ژیا، پاش بردنی مامۆستا بۆ

نەخۆشخانەی (ئاسیا) لە تاران بەمەبەستی نەشتەرگەریکردنی ملی و مانەوەی بۆ ١٦ڕۆژ کۆچی دوایی کرد. پاشان تەرمەکەی لەمەراسیمێکی شایستەدا دەهێنرێتەوە بۆ سنەو بەخاك دەسپێردرێت لە گۆڕستانی (شێخ ئەحمەد باقر).

★ مامۆستا خاوەنی چەندین کتێب و نامیلکەیە بە زمانی فارسی، ئەوانیش:

کتێبەکان

١. دەربارەی کوردستان.

٢. حکومەتی ئیسلامی.

٣. دیالەکتیکی ئیسلامی.

٤. حیجاب.

٥. نامیلکەی دین و ئینسان

٦. نامیلکەی فیترەت و هیدایەت. و چەندین نامیلکەی تر...

سەرەڕای بلاّو کردنەوەی چەندین بابەت و ووتار و بەیاننامە کە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە بلاّوی دەکردنەوە، جگە لەوانەش مامۆستا نزیکەی (٤٠٠-٥٠٠) کاسێتی تۆمارکراوی ماوە جگە لەژمارەیەکی تری کە فەوتاون و یان باش تۆمار نەکراون کە بە هەردوو زمانی کوردی فارسی وتراون. هەروەها سەرجەم شیعرەکانی مامۆستا لەدیوانێکدا کۆکراونەتەوە بەناوی (دیاریێ بۆ یاران).

## سەرچاوەكان

١. سایت و گروپی مەكتەب قورئان.

٢. گۆڤاری پەیامی ڕاستی ژ٧٩/ بەناونیشانی "كاك ئەحمەدی موفتی زادە دڵسۆزی كورد و كوردستان": م.بورهان موحەممەد ئەمین.

٣. گۆڤاری بانگی هەق، ژ:١٩/ نوسینی: لهۆن قادر

٤. سەروەت عەبدوڵڵا: دەروازەیەك بۆ خەباتێكی نەناسێنراو.

٥. د.یاسین سەردەشتی: كوردستانی ئێران(١٩٣٩-١٩٧٩).

# دەستنوێژ

کۆمەڵگای ئێمە بەناو کۆمەڵگای دینیە، بە سەرکردایەتی و ڕابەری کۆمەڵێك لە شێخ و مەلا، چەند ساڵێکە هەوڵمان ئەوەیە کە کارێك بکەین پەردە لە ڕووی حەقیقەتی دین لابدرێت و مەردم ئەو حەقە تەبیعیە کە هەیانە دەربکەوێ و ڕزگاریان ببێت بە دەست ئەم دینە شەیاتینیەی فەرزی ئەکەن بەسەرخەڵکدا، شوکر بۆ خوا سەرکەوتوو بوین، توانیمان بەرهەمێك بەدەست بێنین، ئومێدەوارم کە ئەم بەرهەمە بە وردی و لێبڕانەوە مومارەسە بکەین. ئەو دینە درۆییە کە سەرکردایەتی دینی کۆمەڵگەی ئێمە نیشانی ئەدات بە مەردم، لەگەڵ ئەوەی ئێمە ئەیناسێنین زۆر جیاوازە، هەربۆیە ئەکرێ لە هەر بەشێکدا پرسیاری جۆراوجۆرتان بۆ پێش بێت، جونکە ئێمە هەوڵ ئەدەین ئیسلام بە شێوە واقیعیەکەی بناسێنین، کە ئەمەش ناتەبایە لەگەڵ ئەو ئیسلامەی لە کۆمەڵگادا هەیە.

هەرچەند کۆمەڵگەی ئێمە ئیسلامی پێدەڵێن یان کۆمەڵگەی موسڵمان، بەلاّم واقیعەن ئیسلام دوورە لە کۆمەڵگەی ئێمە، کۆمەڵگەی ئێمە بەتەواوی نابەڵەدە و ناشارەزایە بە ئیسلام، ئێمە لەم مەدرەسەی خۆمانەوە کاتێ مەسەلەیەك پێشکەش ئەکەین، ئێوە کە خوێنەوارن لێکی ئەدەنەوە و سەحیحی و ناڕونیەکەی دەستنیشان ئەکەن و پرسیاری لەبارەوە ئەکەن، هەقیش هەروایە ناکرێ یەکسەر قبوڵی بکەن، هەر بابەتێك کە نیشان ئەدرێ، حەقی ئەوەیە کە هەوڵ بدەن لەڕوی مەنتیقەوە دەلیلەکەی قبوڵ بکەن، خۆشبەختم کە ئەمەش لە مەدرەسەی

ئێمە لەبەرچاو گیراوە و هەمیشە بابەتەکانمان بە پرسیارەکانی ئێوە زیاتر لێکدراوەتەوە.

دەست نوێژ بەرنامەیەکی ئیسلامی بۆ ئیسلام بەفەلسەفەی واقیعی خۆی و مەنتیقی خۆی لە کۆمەلگەی ئێمەدا نیە، شتێك هەیە بەناوی ئیسلام، نوێژەکە هەیە، دەست نوێژەکە هەیە، ڕۆژووەکە هەیە، کار و کردەوە سادەکە هەیە، بەلاْم ئیسلامە واقیعیەکە نیە، کۆمەلێك لە شەعائیر و بەرنامە گەلی ئیسلامە، بێ باقی ئەحکام و پابەندی گەلی ئیسلام، وە ئەم کۆمەلە لایەنەشی کە هەیە، بێ ڕۆح و فەلسەفەی دینە، ئەگەر ڕۆح و فەلسەفەکەی خۆی بەیان بکرێت، ئەگونجێ حەقیقەتی ئیسلام بێتەوە، وە شێخ و مەلاکانی لایەنگری ئیسلامە ناتەواوەکە، واهیمەیەن هەیە لەگەلْ ئەوەی ئیسلام بە مانا واقیعیەکەی دروست ببێتەوە. ڕەنگە خەبەرتان بێت ئەو مورتەجعینە چ ململانێیەك ئەکەن لەگەلْ ئەم مەدرەسە، تا کارێك بکەن ئێوەی گەنجان ڕوگەردان بکەن لەم مەدرەسە یا کچەکانی ئەم کۆمەلگا چاوترسێن بکەن لە نزیکبونەوەیان لەم مەدرەسە، یاخود لەلایەنی عەمەلیەوە ڕەنگ بێت بیستبێتان لەمەریوان بە پالْپشتی شێخ و مەلایان چۆن مەدرەسەی ئێمەیان داخست، وە چ لەشکرکێشیەکی نابەرامبەریان کرد، بە دار و بە تێلاْو بە قەمە بە زنجیر و بە ئەنواع شێوە لەم مەدرەسەیاندا کە ئێمە دروستمان کرد. بەم حالْەوە کە ئەوان ئەم ململانێیە ئەکەن، کارێك ئەکەن مەردم ڕوو زەردیان بێت لەم مەدرەسە، هێشتا باشە سوپاس بۆ خوا، زۆر کەسی بە شەهامەت پێشوازی ئەکەن لەم مەدرەسە، لێرە ئیسلام بەو شێوە واقیعیە بەجێ دێت، بۆیە بەو جۆرە لەشکرکێشیە دژایەتی ئەم مەدرەسە ئەکەن و ئەیانەوێ ئەم

مەدرەسە لە نێو ببەن، ڕاستی ئەگەر ئیسلام بەشێوە واقیعیەکەی دروست بێتەوە، ئەوان زەرەر ئەکەن، تەقریبەن حەقیانە بە ئیعتبار ئەمە، ئەکەر ئیحترام بۆ بونیان قایل بێت، حەقیانە بەرگری بکەن لەسەر ئەو دینە ناتەواوەی خۆیان و نەهێڵن دیانەتی موحەممەد (صلی الله علیه واله وسلم) بکەوێتە دەر و ڕۆشن ببێتەوە بۆ خەڵك. هەربۆیە ئێمەش هاوشێوەی ئەوان هەوڵ ئەدەین، ئەوان نایەنەوێ ڕوی ڕاستەقینەی دینەکە بکەوێتە دەر، ئێمەش هەوڵ ئەدەین بە دیاری بخەین.

یەکێ لە خاڵە گرنگەکان لەم کۆمەڵگای ئێمە کە پێی ئەوترێ کۆمەڵگای ئیسلامی، وەکو وتم نوێژ هەیە ڕۆژوو هەیە دەستنوێژ هەیە، بەلاّم هەرگیز کەس ناڵێ نوێژ بەکاری چی دێ؟ ڕۆژوو بەکاری چی دێ؟ دەست نوێژ بەکاری چی دێ؟ چونکە ئەگەر قەرار بێت سود و فەلسەفەی ئەم ئەحکامە بەکار بێت، ئەکێشێتەوە بۆ لای ئیسلامە واقیعیەکە، ئەو ئیسلامەی کە فەلسەفەی هەیە، مەنتیقی هەیە، ژیانی هەیە، ئەتجوڵێنێ، ڕۆحی ئینسان ئەخاتە هەیەجان، نایەڵێ ئینسان بە زیللەت و داماوی و گێلی ڕازی بێت، چونکە ئەکەر فەلسەفەی هەرکام لەم حوکمە باس بکرێت، ڕای ئەکێشێ بەرەو ئەو ئیسلامە واقیعیە. تەماشا ئەکەی لە ناو کۆمەڵگەی ئێمە بەحسێك نیە لەم بارەوە، دەلیلەکەشی ئەوە نیە نەزانن، ڕەنگ بێت بزانن، کۆمەڵێ هەبن تێگەیشتنیان لە ئیسلامە واقیعیەکە هەبێت، بەلاّم کۆمەلاّنی شێخ و مەلا لایەنگرانی خۆیان زیاتر ئەکەن بۆ ئەوەی کە بەرژەوەندیان تیایدا هەیە، چونکە هەندێ شت بە باشی نازانن بۆ بەرژەوەندی خۆیان بۆ خەڵکی ڕۆشن بکەنەوە.

# حیکمەتی دەستنوێژ چیە؟

بە وتەیەکی سادە تەماشای ژیانی ئینسان بکەین، تێئەگەین کە جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ ژیانی زیندەوەرانی تردا هەیە کە لەسەر گۆی ئەم زەویە ئەژین. یەکێ لە جیاوازیە سادەکانی ئەمەیە کە گیاندارەکان گشتیان، بە جیاوازی شێوازی ژیانیانەوە غەریزەیەکیان هەیە دیاریکراو، هەر گیانداری بە غەریزەی خۆی هەوڵ ئەدات و خواردن پەیدا ئەکات بۆ ژیانی خۆی و بەردەوامیدان بە زیندەگی خۆی. کەسانی یەك جۆر گشتی لە جۆری ژیانیاندا یەك شێوازن، بە زاراوەیی ئەفرادی جۆری ئاژەڵ، بە تایبەتمەندی جۆری ژیان ئەگوزەرێنن، ئەوە کە لە بایلۆژیدا ناودەبرێ بەناوی تایبەتمەندی جۆری، کە بۆ هەر ئاژەڵێك ئەڵێن ئەمە جۆری تایبەتمەندیەکەیەتی، تەنها جۆرەکە لێك ئەدەنەوە، کاریان بە فلاَن و فلاَنەوە نیە. هەر جۆرە ئاژەڵێ بە تایبەتمەندی جۆری خۆیەوە ژیان ئەکات، بەلاَم ئەی مرۆڤ چۆنە؟!

مرۆڤیش تایبەتمەندی جۆری هەیە، بەلاَم کافی نیە. ئەبینین مرۆڤ، جیا لەو تایبەتمەندیە جۆریەی کە هاوبەشە لەنێوان خۆی و باقی مرۆڤەکانی تردا، جۆرێ لەتایبەتمەندی کەسێتی بۆ کەسەکان پێش دێ، وەختێ بەراورد ئەکەی لەنێوان کۆمەڵە کەسێکدا، سەیر ئەکەی ئەو بە ڕێگایەکدا ئەچێ، ئەم ١٨٠ دەرەجە پێچەوانەی ڕێگاکەی ئەوە، لە کاتێکدا لەناو ئاژەلاَنی یەك جۆردا، گشتی یەك جۆر زیندەگی ئەکەن و هەموی یەك جۆرە. بەلاَم لە مرۆڤدا ئەبینین، لە ئەوپەڕی نادروستی خیانەت و ستەم و زوڵمدا، ئەگەر هەموو گیان و ماڵی مەردم بکاتە ناو چنگی، هەڵێئەلوشێ

و هێشتا تێر نابێت، ئینسان تریش ئەبینین لەبەرامبەریەوە، لە مونتەهای ڕاستگۆیی و ئیخلاسدا، ئەگەر تەواوی ماڵ و گیان و ئەوەی وا لە ئیختیاریدا کە خۆشەویستە، بیدا بە مرۆڤەکان تێر ناخوا، ئایا ئەتوانین ئەفرادێك ئینسان تەنها بە پێوانە و ئاوێنەی تایبەتمەندی جۆری بناسین؟! ئایا ئەم دوو فەردە ئینسانە یەکیان لە ئەوپەڕی باشیدا و یەکیان لە ئەوپەڕی خراپیدا، یەکێکیان لە ئەوپەڕی خزمەتگوزاریدا، یەکیان لە ئەوپەڕی خیانەتدا، یەکیان لە ئەوپەڕی خێرخوازیدا، یەکیان لە ئەوپەڕی بەدخوازیدا، ئەتوانین وەك ئەفرادی یەك جۆر لە ئاژەڵان بە یەك پێوانە تەماشایان بکەین؟! بێ موبالەغە چەندێك لەبەین دوو جۆرە ئاژەڵدا، دوو فەرد لە دوو جۆرە ئاژەڵدا ئیختلاف و جیایی وجودی هەیە، لەبەین ئا ئەو دوو مرۆڤە کە هەردوکیان لە یەك جۆرن، ئەوەندە جیایی بونی هەیە! ئەو ئینسانە چاکە و ئەو ئینسانە خراپە. ئەزانین کە ناتوانین بە پێوانەگەلی جۆری تەماشای ئەفرادەکانی مرۆڤ بکەین، بۆ مرۆڤ زیاد لە تایبەتمەندی جۆری، شت گەلێکی تر بونی هەیە، شت گەلێك کە ئیحتمالی هەیە، بیگەیەنێتە ئامانجی گەورە گەورە، یا شت گەلێك بەو بارەکەی تردا، لە ئامانجی گەورە دوری بخاتەوە، بیبات بەرەو خراپی و حەسادەت. ئەنجامی ئەمەش ئەوەیە کە مرۆڤ وەك باقی دروستکراوانی تر، بە تەنها تایبەتمەندی جۆری غەریزەکانی ناتوانێ زیندەگی بکات. ئەتوانێ باش بێت، ئەتوانێ خراپ بێت. لەهەر ڕێیەکدا کە هەڵی ئەبژێرێت، ئەتوانێ زۆر بچێتە پێشەوە، ئەتوانێ کەم بچێتە پێشەوە، یانی چاکی و خراپیش سنورێکی دیاریکراوی نیە، بەنمونە باشی

ئەگەر بیکەینە ١٠٠بەشەوە، لە یەك لە سەدەوە هەیەتی تا ٩٩ لەسەد، بەهەمان شێوە خراپیش، ئەگەر بیکەینە ١٠٠ بەشەوە، لە یەك لە سەدەوە هەیەتی تا ٩٩لەسەد، ئەمە جیاوازیەکە کە مرۆڤ هەیەتی لەگەڵ گیاندارەکانی تردا. وەختێ ئینسان ئەم خاسیەتە فراوانەی هەیە، کەباش بێ یان خراپ بێت، چی گرنگە؟ ئەوە گرنگە کە بەرنامەیەك بێت، بتوانیت ئەو ئامادەسازیە نا مەحدودە وا ئینسان هەیەتی پەروەردەی بکات و پێی بگەیەنێت لە ڕێگای باشیدا، تاکی ئینسان خودپەرستی نەبێتە ئامانج بۆی، کە ئەگەر تەواوی ئەفرادی تر، لە هاو جنسی خۆی فیدا بکات بۆ خۆی هێشتا تێر نەخوات، بەڵکو جۆرە بیرکردنەوەیەکی بێت، ئاوات و ئارەزویەکی بێت، هەم بۆ خۆی زیندەگی بکات، هەم بۆ ئەفرادەکانی وەك خۆی، هەم سود بەخۆی بگەیەنێت، ئەمەش بە شێوەیەکی نۆرماڵ ناکرێ و نابێ، چونکە بۆ خۆی بەشێوەیەکی سروشتی کۆمەڵێ باشن و کۆمەڵێ خراپ، بەڵکو بە خۆپێگەیاندن و پەروەردە مرۆڤ زیهنی ڕۆشن دەبێتەوە. بە پەروەردە مرۆڤەکان بار ئەهێنرێن بۆ ئەوەی بە چ لایەکدا برۆن، بۆ لایەنی ڕاستی، بۆ لایەنی چاکە، کە هەوڵەکانیان بەفیرۆ نەچێت، نەبێتە ئافەت و بەلا بۆ خۆیان و خەڵك.

# پەروەردە چیە؟

مانایەکی زۆر فراوانی هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی سادە پەروەردە دوو جۆرە:

١. پەروەردەی یاسایی:

جۆرێکە لەپەروەردە، کە دانانی یاسایە بەوەی کە بڵێی بە بەرامبەر حەقت هەیە ئەوە بکەی، حەقت نیە ئەوە بکەی، ئەمە مافتە، ئەمە ئەرکتە، ئەمە بەرپرسیارێتیتە بەرامبەر بە کۆمەڵگا، ئەمە پاداشتە لەبەرامبەر ئەوەدا. بەحوکمی یاسا ئێمە لە وڵاتێکدا ئیدارەی کۆمەڵگا بکەین، خەڵکی بەپێی تێڕوانینەکانی یاسا کاروبارەکانیان جێبەجێ بکەن و چاوەڕوانیان ببێت لە کۆمەڵگا.

٢. پەروەردەی دینی:

ئەم جۆرە پەروەردەیە، بەر لەوەی یاسا و بڕیاردابنێ، کار لەسەر لایەنی دەرونی مرۆڤ ئەکات. پەروەردەی ئەکات و ڕێگای نیشان ئەدات، کەسێتی دروست ئەکات، جا دوای ئەوەی کەسێتی بۆ دروست کرد، یاسا و بڕیارەکانی پێ نیشان ئەدا.

جیاوازی لەنێوان پەروەردەی دینی و پەروەردەی یاسای، لەهەر لایەنێکەوە تەماشا بکەین دەبینین، کە پەروەردەی یاسایی، بەتەنها  شتێکە لە سنوری ئیدارەی حەیواناتدا، لەو سنورە لانادا، چونکە ئەوە مەترەح نیە لە پەروەردەی یاسایدا کە مەردم خۆشیان بێت لە شتێك یان خۆشیان لێ نەیێت، ڕۆحەن قبوڵیان کردبێ، یان قبوڵیان نەکردبێ، دەستورە ئەبێ وابن، یاسا داوایان لێ ئەکات کە ئەبێ وابن. بەم دەلیلە لەهەر جێگەیەکدا

زۆر یاسا دیار بوو، مەردم یاسا و بڕیارەکان ڕیعایەت ئەکەن، بەڵام ئەگەر یاسا دیار نەبوو؟! هیچ.

نمونەیەکی بچوك دێنمەوە، ماوەیەك لەمەوبەر لەسەر بابەتێك کە لە کۆمەڵگای خۆماندا لەگۆڕێدا بوو، لە تەك یەکێك لە پلەدارانی وڵاتی خۆماندا، شەڕە قسەمان بوو، ئەم ئینسانە بە پێوانەی پەروەردەی یاسایی کە پێشتر ڕونمان کردەوە فیکری ئەکردەوە، جا لای ئەو کەسانە ئینسانیەت گرنگ نیە، یاسا و بڕیار بۆی گرنگە، میللەتێکیان ئەوێت وەك ئاژەڵ، ئەوان چی بڵێن، ئەمان بڵێن ئیتاعەت! نایانەوێ مەردم ئینسان بن، چونکە ئەگەر ئینسان بن، ئیتر ئیتاعەت لەوان نامێنێ. حەقی پێ ئەدەم ئاوا بیر بکاتەوە، چونکە بەو بیرکردنەوە و تێڕوانینەی هەیانە، ئەبێ ئاوا بێت و یاساییانە بیر بکاتەوە! نمونەی هێنایەوە بۆ چەسپاندنی بیرکردنەوەکەی، وەختێك لە کۆمەڵگایەکدا کە ڕێنمایی و یاسا دائەنرێ، مەردمێك کە هەمیشە حەزیان بەوەیە خیلافی یاسا بکەن و لەیاسا دەربچن، ئەبینین وەختێ سەرپێچی ئەکەن، وەختێ ئەفسەرەکە دێ غەرامەیان بکات، هاوار و داد ئەکەن و دەنگ بەرز ئەکەنەوە و ئەڵێن ئەمە زوڵمە، ئەمە ناحەقیە، خۆت زوڵمەکەت کردووە، بۆ یاساکەت شکاندووە؟! ئەمە پاساوێك بوو ئەو بەکاری برد، بۆ ئەوەی کە مەنتیقی من بپشکنێ، بەڵام بەداخەوە بە زەرەری خۆی تەواو بوو، وتم هەر لەم نمونەی تۆوە سود وەرئەگرم بۆ ڕەدی قسەی تۆ، وتم بزانە بایەخی ئەم یاسایە هەر خودی ئەم یاسا سەروەرییە چەندێ زۆرە، ئەمەم قبوڵە لە کۆمەڵگایەکدا جادە و خیابان شلۆق و جەنجاڵ بێت، بۆ ڕێکخستنی پیادە و ماشین ئەم یاسا ببێت. بەڵام ئەگەر لەدیدێکی ترەوە تەماشای بکەین، تا

چەند ئەم قانونە هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا ئەگرێتەوە بە بێ جیاوازی؟!
ئینجا لەسەر تا خوار نمونەم بۆ هێنایەوە، وتم ئایا لە جادەیەکدا کە خەڵکی زۆری بەسەرەوەیە و لە ناوەڕاستدا خەتی بۆ کێشراوە تا سەیارە بەسەریدا هاتوچۆ نەکات، تا چەند ئەمە ڕیعایەت ئەکرێ؟! ئەی کاتێ ئۆتۆمبێلی فریاکەوتنی خێرا دێتە سەر جادە تا چەند پابەندی ئەو ڕێنماییانە ئەبێت وا شەقام پەیوەستە پێیانەوە، ئەسڵەن فەرمانبەرانی هاتوچۆ کە کاریان پاراستنی یاسایە، دەبنە پێشێلکاری یاسا و ڕێگای بۆ ئەکەنەوە، یان ئەفسەر و پۆلیسی ڕێنمایی هاتوچۆ بۆ خۆیان تا چەند پەیوەستن بە ڕێنماییەکانی هاتوچۆوە، پێم وایە زۆرترین پێشێلکاری ئەوان ئەیکەن! یاخود کەسانی پلەدار و بەرپرسی ئەم کۆمەڵگایە کاتێ دێنە شەقامەوە تا چەند پابەندی ڕێنماییەکان ئەبن و ئامادەن لێپێچینەوەیان لێ بکرێ لە ڕوی یاساییەوە؟! ئینجا وتم تۆ کە باسی یاسا ئەکەی، خۆت پابەندی پێوە ئەکەی؟ لەسەر تا خوارتان پابەند ئەبن پێیەوە؟ وتم تۆ یاسایەك دائەنێی بۆ دەست و پا بەستنی مەردم، کەچی خۆشت ئاوا ڕیعایەتی ئەکەی؟! ئیتر دەمی بەسترا و تا ماوەیەك هیچی نەوت، پاشان وتی من تا بۆم بکرێ هەوڵم داوە یاسا شکێنی نەکەم، هەرجارێ کە سوار ماشینەکەم ئەبم بە شۆفێرەکە ئەڵێم پابەندی ڕێنمایی بە! وتم ئەمە بووە زەوقی خۆت نەك پێوانە و مقیاس بۆ هەموتان.
ئەنجام دەگەینە چەند حەقیقەتێك لەمەی باسمان کرد، ئەوە بۆ وایە؟! سروشتیە ئەبێ وابێ، چونکە بەتەنها یاسا و دەستورە، شتێك نیە

تەئسیری کردبێتە ناخ و دڵمان، شتێك نیە لەناخی دڵیانەوە بە ئاگا و نائاگایی قبوڵیان کردبێت، لەبەر ئەوە ئەبینین خودی ئەوانەی وا یاساکەیان داناوە، زیاتر سەرپێچی ئەکەن تا خەڵکی تر. ئەمە ئەم بارە، بەڵام ئەی پەروەردەی دینی چۆنە؟!

پەروەردەی دینی  بە لەبەرچاوگرتنی لایەنی دەرونیەوە، بە عەقڵێکی ڕاست و چاکەوە پەروەردە ئەکات، لەوەو دوا لەژێر ڕۆشنایی ئەو بیرکردنەوە ڕاست و بەجێیە،  پێشنیاری بەرپرسیارێتی ئەکات بۆ مرۆڤەکان، چونکە مرۆڤ بەشێوازی کائینێکی بەڕەلا ناناسێت، بەڵکو مرۆڤ وەکو کەسێکی پەیوەست بە نیزامێکەوە کە هێناویەتە ئەم دونیایە و ئەرکێکی لەسەرشانە، ڕێگایەکی هەیە، ئەنجامیش بەرامبەر ئەوەستێنرێ لەگەڵ کاروکردەوەکانیدا و پاداشتەکەی ئەبینێتەوە. ئەمەش ئاوا ئەناسێنرێ، لەوەودوا لەژێر نوری ئەو بەرپرسیارێتیە، ئەو ئەرکە،  کە دەرونی مرۆڤی پێ ئاراستە ئەکرێ، ئاگایی و بەرچاو ڕۆشن ئەبێتەوە، واتە کەسێتی پێ ئەدرێ، تایبەتمەندی ئەخلاقی دائەمەزرێ، زانین و ئەخلاقی هاوتەریبی یەك بن. وەختێ ئینسان ئا بەم شێوازە پابەندی وەرگرت و شکڵی گرت، زانین و ئەخلاقی هاوتەریبی یەك بون، ئەوەی وا پێی ئەوترێ، وا بکە و وا مەکە، ڕیشەی وا لە دەرونی خۆیدا. واتە لە ناخی دڵی خۆیەوە، ئەو ئسوڵە قبوڵ ئەکات، جا دوای ئەوە بە گوێچکە گوێی لێ ئەبێ.

دواجار ئەزانین کە هەر یاسا و بڕیارێك بدرێ هاوتەریب بەو ئسوڵ و بنەمایانە بدرێ بە ئینسانێکی دینی، مرۆڤێکی دیندار، بێ ئەوەی چاودێری و سەرپەرشتی بوێ، بە ئەوپەڕی گەرموگوڕیەوە قبوڵی ئەکات.

ئەنجام بەشێوەیەکی سادەترئەمەیە، مرۆڤی یاسایی، لە وەختێکدا کە چاودێری یاسایی نەبێ، حەز ئەکات بیشکێنێ، چێژ ئەبات لەوە، چونکە بەزۆرە و دەستورە. بەلاٌم مرۆڤی دینی، ئەگەر تەواوی هێز بکەوێتە کار، کە لایدا لە ڕێگای خۆی، لەبەرنامەی خۆی، لەو یاسا و بڕیارەی پێی وتراوە، تەواوی فشارەکان بەگەڕ بخرێن، بۆ ئەوەی خیلاڤ کارێك بکات کە لەڕوی کەسێتی خۆیەوە قبوڵی کردووە، لەت لەت و تیکە تیکەی بکە، قبوڵی ناکات، لانادات لەو یاسایەی کە بە دینی خۆی قبوڵی کردووە . ئەمە جیاوازی نێوان ئەم دوو مرۆڤەیە بەشێوەیەکی سادە، کە ئەو لەزەت ئەبات لە شکاندنی بڕیار و یاساکان، بەلاٌم ئەم هەموو گیانی بشکێنە، ڕازی نیە یاساکانی بشکێنێ.

ئێمە بۆچی دەستنوێژ بشۆین؟ لەبەرامبەردا ئەمەیە ئێمە ئەمانەوێ نوێژ بخوێنین، ئەی نوێژ بۆچی بکەین؟ لە پێشدا وتم کە لە پەروەردەی دینیدا، لایەنی دەرونی ئاگایی پەیدا ئەکات، لەسەر ئەساسێکی مەعریفی کە تەواو بەرپرسیارێتی بۆ مرۆڤ ڕۆشن ئەکاتەوە و پاشان ئاڕاستە ئەکرێ. دوای ئەم قۆناغە، ئەمە دێتە پێش کە دەرونی نائاگایی لەتەك ئەو ئاگایی و زانیاریەدا وا پەیدای کردووە شکڵ بگرێ. بینای دروستکردنی ئینسانی موئمین ئەمەیە، لێرەوە دەست پێئەکات، نوێژ بۆ ئەمە ئەکرێ، ئینسانی بەدین، قبوڵی کردووە کە وەك ئاژەلاٌنی تر نیە، کە بەتەنها بە پاڵنەری غەریزە زیندەگی بکات، بەڵکو بەرپرسیارێتی هەیە، ئینسانی بەدین، قبوڵی کردووە کە شکڵی گرنگ و ئەساسی ئەم دونیای هەستیە هەر لەخۆوە و بەڕێکەوت نیە، بەڵکو لەڕێگەی ئیرادەی

ئاگاهیێکەوە، ئەم ڕێکخستن و نیزامە لەم بونەدا بەدی هاتووە. هەزاران ساڵ مرۆڤەکان هەوڵ ئەدەن بۆ ئەوەی گۆشەیەکی لێ کەشف بکەن و بزانن، گەورەترین زاناکان، کاتێ ئەگەنە گۆشەیەك، هەزار و یەك پرسیاریان بۆ پێش دێ، کە ناتوانن لە وەڵامیدا. ئەزانن ئەم ڕێکخستنە گەورەیە، کە هەزاران زانا لەبەرامبەر گۆشەیەکیدا دەستەوسانن، هەروا لەخۆرا و بە هەوانتەیی دروست نەبووە. مرۆڤی ئیماندار ئەزانێ کە باشی و خراپی یەك جۆر نیە، باشی مەفهوم و پێوانەیەکی جێگیرە، وە خراپی مەفهوم و پێوانەیەکی جێگیرە. جیاوازی هەیە لەنێوان ئەمە کە مرۆڤ تایبەتی زیندەگی بکات، یان خراپ زیندەگی بکات، ئەزانێ ئەمە تێگەیشتنێکی گۆڕاو نیە، خودی چاکی و خراپی، کە قەی چیەکا هەرکەس مەیلی هەیە، کێ بەکێ ئەڵێ باش و بەکێ ئەڵێ خراپ، کەیفی خۆیەتی! ئەزانێ کەوانیە. ئەزانێ مرۆڤانێك تەمەنێك ئەگوزەرێنن لە ڕێگەی باشیدا، لە ڕێگەی ئاسودەیی مرۆڤەکاندا و هەوڵی ئارامی ئەدەن بۆ خەڵکەکانی دەوروبەریان، جیاوازیان هەیە لەگەڵ ئەو مرۆڤانەدا تەمەنێکیان گوزەراندووە لە پیاوکوشتن و ترس و تۆقاندنی خەڵکیدا، وە ئەمرن و مێشێك نایانگەزێ. بێ ئەوەی کەمترین زەرەریان پێ کەوتبێ، دەورانی خۆشگوزەرانی خۆیان تەواو ئەکەن، ئەزانێ مرۆڤی ئیماندار ئەم دوانە جیاوازیان هەیە، چونکە ئەم نیزام و سیستمەی ئەم بونەی دروست کردووە، بەرنامەیەکی بۆ داناوە، ئەنجامیش پاداشت و سزا بەپێی جۆری پەیڕەوی کردن لەو بەرنامەیە ئەنجام ئەدا.

وەختێك ئینسانی ئیماندار دەرکی ئا ئەم ڕاستیە ئەکات ، بەم نورە فراوانەوە تەماشای زیندەگی ئەکات و تەماشای خۆی ئەکات، تەماشای

ڕەفتار و جوڵە و سەکەناتی خۆی ئەکات، فرە ئامادەیی هەیە کە بە جۆرێ هەڵسوکەوت بکا، کە موتەناسیب بێ لەتەك بەرپرسیارێتیەکەیدا. بە جۆرێك لە وەختێکدا حسابی باشی و خراپی جیائەکرێتەوە لەیەك، گیرۆدەی شەرمەندەیی نەبێ، نەکەوێتە ناو دەستەی ئەوانەی وا دوژمنی ئینسانیەتن و خیانەت ئەکەن بە مرۆڤایەتی، حەز ئەکات بەو جۆرە ڕەفتار بکا. ئەمە شتێکە سروشتی، وەختێ ئینسان گرنگ نیە بۆی، باش ڕەفتار بکات یا خراپ ڕەفتار بکات کە لە ناخی دڵی خۆیەوە بەرپرسیارێتی هەست پێ نەکات، گرنگ نەبێ بۆی باشی و خراپی، جیاوازیەك نەبێ لەمەدا کە باش ئەکات یا خراپ ئەکات. وەختێك تەماشای کرد هیچ دەسەڵات و فەرمانێ بەسەریەوە نیە و هەستی بە بونی هیچ بەرپرسیاریەتیەك نەکرد لە کاریدا، هەرچی کرد بە مەیل خۆی بوو، هیچ جیاوازیەك نەبوو بۆی باشی کردوە یا خراپی کردوە، سروشتیە مەفهومی باشی و خراپی ئەرزشی نەمێنێ لەلای، بەڵام وەختێ لە سەرەتاوە ئەو پۆلێن و پێوانەییەی لە قوڵایی زهنیدا قبوڵ کردبێ، سروشتیەن حەزئەکا ڕێگەی باشی بپێوێ، کە هەوێنی سەربەرزی و ئیفتیخار و حەیاتی ئینسانیە، نەڕێگەی خراپە کە هەوێنی زیللەت و سەرشۆڕی و نارەحەتیە.

نوێژ بۆ ئەم ئینسانە بەم دید و مەعریفەتەوە مەترەحە ، ئینسانێ کە ئەم بیرکردنەوەی نیە، ئەم هەستی بەرپرسیارێتیەی نیە، ئەم وەزیفە نەناسێ، بێگومان نوێژ تەنها جوڵەیەکە، حەرەکاتێکە وەرزشی!

نازانم ئەزانن یان نا، ئا ئەمانەی وا سەرکردایەتی ئەم دینە ساختەیە ئەکەن لە ناو ئەم کۆمەڵگایەدا، حەز ئەکەن شتێ بڵێن لەبارەی دینەوە بەڵام ڕاستیەکەی نەڵێن، هەربۆیە کاتێ پرسیار ئەکەی لەبارەی مەسەلەن نوێژەوە کە سودی چیە؟ ئەڵێن وەرزشێکە، پرسیار ئەکەی لەبارەی دەستنوێژەوە کە سودی چیە؟ ئەڵێن: نەزافەتێکە، پرسیار ئەکەی لەبارەی ڕۆژوەوە کە سودی چیە؟ ئەڵێن: ڕێجیمێکە. یانی بچوکترین سودی ئەڵێن، بەڵێ ئەمانەشی تیایە، بەڵام ئەمە بچوکترین ئەرزش و بایەخە، حەز ئەکەن دین لە بچوکترین سود و ئەرزشدا خوڵاسە ببێتەوە، ڕەنگە واقیعیەکەی مەترەح نەبێ ، بەڵام هیچ کام لەم عیبادەتانە بۆ ئەمە نین، نوێژ بەو جۆرە کە ئەوان ئەڵێن وەرزش نیە، هەڵسان و دانیشتن و فەعالیەت لەبەر خاتری ئەمە نیە، ئەمەشتێکە فرە بچوکە و بۆ تەنها نەزافەتێ لیباس و بەدەن و خۆشۆرینی زیندەگی نیە، لەگەڵ ئەوەی ئەمانە مەرجی نوێژە، بەڵام خاڵێکی فرە بچوکن، یا دەستنوێژ تەنها بۆ خاوێنی جەستە نیە لەتەك شتەکانی دەرەوەی خۆیدا، ئەمە سودێکی فرە بچوکە، گرنگتر ئەوەیە کە ئەو ئینسانە وا وتمان ئینسانێ دینی، ئەوەی وا بە پەروەردەی دینی پەروەرش ئەبێ ئەو ئینسانە مەسولیەت شوناسە، ئەو ئینسانە وەزیفەت شوناسە، وە لەخەتێ ڕاستدا ئەکەوێتە ڕێ، لەخەت خاسیا ئەکەوێتە ڕێ، هەست ئەکات کە پابەند بێت باشە، نوێژ بەکاری ئەو ئینسانە دێ کە ڕێ بکات. ئەم ئینسانە کە مەوجودێکە بەرپرسیار لەم نەزمە لەبەرامبەر ئافەریندەی خۆی و ئەم نەزمەوە دینی قبوڵ کردووە و خۆی بە موسڵمان ئەزانێ. ئەنجام هێزێك کە ئەم ئەیگرێ، لەم ڕوی بیرکردنەوەوە سەرچاوە ئەگرێ، لە ئەو ئەسڵ و دەرکەوە دەسگیری

ئەبێ ئینسانی ئیماندار ئینسانی موسڵمان، تەنها ئەمە گرنگە بۆی کە ئەو ئافەریندە وا ڕێکخستنی بووە بۆ وجودی من و بونی داناوە، چ بە بەرژەوەندی ئەزانێ بۆ من کە موتەناسیب بێ لەتەك وجودی خۆم و وجودی  بوندا، ئەبێ بەو جۆرە ڕەفتار بکەم.

ئەو ئینسانە کە توانی دەرونی بەو ڕاستیانە ڕۆشن بکاتەوە، تەنها حەز ئەکات بەپێی ئەو تایبەتمەندیانە وا دەرکی کردووە حەز ئەکا زیندەگی بکات، نوێژ بۆ ئەو ئینسانە بەکاردێ، کە سەرەتا پەیوەندی لەتەك ئەو ئەسلاێ وا یاسای لێ دەردێنێ، کە بەرنامەی زیندەگی لێ ئەسێنێ، پەیوەندی هەبێت. هەڵبەتە ئەو ئەسڵە عیبارەت نیە لە لەدەزگای پۆلیس بۆ نمونە، یان سوپا، بەڵکو مەبەست لێی ئەو ئەسڵەیا وا لەناو دڵیەوە سەرچاوە ئەگرێ و بونی خۆی لەوەوە هەست پێ ئەکات، وا ئەزانێ ئەوە وا هەیە بە ئیرادەی ئەو هەیە. ئەم ئینسانە پێویستی هەیە بەمە کە پەیوەندی گەرم بێ  لەگەڵ دروستکەری خۆیدا، خۆشەویستی هەبێ لەبەرامبەر دروستکەری خۆیدا، بۆ ئەوەی وا هەست بکا بەو ڕێیەدا ئەو دیاری کردووە زیندەگی بکا و لەڕێگەی ئەو لانەدا، چونکە پەروەردەی ئەم ئینسانە پەیوەردەیەکی یاسایی نیە، کە بە زۆر لەسەر ڕێگەی باشەوە بێت و لە خراپی لایبدات. پەروەردەی دینیە بە هەموو هەست و مەیل و ڕەغبەتی خۆیەوە خراپی لائەدات، ئەگەر دارکاری بکەی و دەسوپێی ببڕی بۆ ئەوەی کارێکی خراپی پێ بکەی نایکات، چونکە لە کەسێتی ئەودا نیە ئەو کارە بکا، ئەوەی لە کەسێتی ئەو داواکراوە خۆشەویستی و سۆزە، تاوەکو بەینی خۆی و خوای ڕێکو پتەو بکا. هەرچەند مەحەببەت و

خۆشەویستی ئینسان نیسبەت بە خوای خۆیەوە زیاتر بێت، بەو ڕێژەیە زیاتر پەیوەست ئەبێ کە بەو جۆرە ئەو بەرنامە وا ئەو داوای ئەکا زیندەگی بکات، وە بەقەد مویەك لانەدا لێی، ئەمە یەکەمین پەروەرش.

پەروەرشی دووەم، یادی بەردەوام کە ئینسان لە نوێژدا لە عیبادەتێکدا کە لە نوێژدا ئەیکات، عەهد و پەیمانێ کە لەنوێژدا ئینسان تازەی ئەکاتەوە لەگەڵ خوای خۆیدا، نوێژ بەکار ئەمە دێت.

یەك نمونەی سادە بۆ جیاوازی ئینسان لە حاڵەتی نوێژدا هەیەتی، لە تەك حاڵاتێ ئاسایی زیندەگیدا، لەم باسەشەوە ئەگوازینەوە یۆ لای باسی دەسنوێژ. بیهێننە پێش چاوی خۆتان، کە ئینسانێك شتێك فرە فرە گرنگ و ئەرزشدار بێت لەلای، یا کەسێ فرە فرە خۆشەویست بێت لەلای، گەرەکی بێ بچێ بۆ دیداری ئەو کەسە، یا بڕوا بۆ بینینی ئەو شتە، بیهێننە پێش چاوی خۆتان کە ئەم ئینسانە بەر لەوەی بیەوێ بچێ بۆ لای ئەو شتە یا ئەو کەسە، کەمێ سەرنجی خۆی ئەدا بزانێ حاڵو باری چۆنە، وریا ئەبێتەوە و لە جلوبەرگ و سیمای ئەڕوانێ، تاوەکو بزانێ هاوتایە لەگەڵ خۆیدا یان نا، بەدڵی ئەو کەسە یان شتەیە کە دەچێتە دیداری. بۆ نمونە یەك ئینسان هاوڕێیەکی خۆشەویستی بووە کە ساڵەها یەکیان نەدیوە، یا بۆ نمونە باوکێك یا دایکێك یا برایەك یا منالێکی ماوەیەك لێی دوور بووە، وە ئێستە قەرارە بیبینێ ، ئەم ئینسانە وەختێ ئەم هەواڵەی پێ ئەدرێ کە بڕوا ئەو خۆشەویستەی ببینێ، جا بەتایبەتی ئەگەر خۆشەویستیەکە هەمە لایەنە بێ، تەنها یەك لایەن نەبێ، بەو واتایەی تەنها لەلایەنی هەست و سۆزەوە نەبێ، بەڵکو لەلایەنی ئەفکارەوە دووبارە ئینسان خۆشی بوێ، لەلایەنی ویژدانەوە خۆشی بوێ،

لەهەرچی لایەنەوە، ئەو وەختە زیاتر ئەم مەسەلە تەحەکوم پەیا ئەکا. ئەم ئینسانە تەماشا ئەکەی بەرلەوە گەیشتبێ و بکەوێتە ڕێ بچێتە لای ئەوخۆشەویستیە، جۆرێك فەعالیەت پەیدا ئەکات کە کاریگەری نائاگایانە لێی دەرئەکەوێ تا ئامادە ئەبێ لە ئەو حاڵەتەوە وا لەپێشدا بویەتی تێتە دەرەوە و بۆ حاڵەتێ تر کە موتەناسیب بێ لەتەك ئەم خۆشەویستەیدا. وەختێ ئینسان نوێژ ئەخوێنێ، حاڵەتێکە کە هەست ئەکا بەرەو دیدارێك ئەچێ لە گرنگترین دیدارەکان کە بۆ ئینسان پێویستە، هەڵبەتە بەو مەرجەی کە ئەو نەزم و ئاگاییەی ببێ، نوێژ بۆ ئینسانێ بەو ئاگاییەوە نوێژە و بایەخێکی واقیعی خۆی هەیە، نە ئینسانێ کە بەعینوانێ وەرزشی یا بە عینوانی عادەتی ئەنجامی بدا، بایەخێ کە نوێژ بۆ ئەو جۆرە کەسانە هەیەتی تەواو کەمە و پوچە، ئەرزشی واقعی بۆ ئەو ئینسانانە کە بەو ئیمان و دەرك و مەعریفەتەوە نوێژ ئەنجامی بدا، بەو ئیمانەوە بێت بۆ نوێژ کردن، دێت بۆ جۆرە دیدارێك بۆ جۆرە بەرنامەیەك کە هیچ کات ئیمکانی نیە لە زیندەگی هیچ ئینسانێکدا شتێ ئەونە گرنگ و ئەرزشدار و موحتەرەم و خۆشەویست پێش بێ، وەك باسمکرد ئەوانە وا خۆشەویست و موحتەرەمن لە دیدی ئێمەدا لە لایەنێ لەلایەنەکانەوە موحتەرەمن، بەلاٚم ئا ئەو دیدارە وا ئینسانی نوێژ خوێن بە ئەو دەرك و ئاگاییەوە ئەنجامی ئەدا لەتەواو لایەنەوە موحتەرەمە بۆی ، خوای خۆی خۆش ئەوێ بە ئەقڵ و شعورو ویژدان و هەست و سۆزەکانیەوە، بە تەواو هێزی ناخ و دەرونیەوە خوای خۆی خۆش ئەوێ، لە حاڵێکدا موحەببەتێ کە لەناو ئێمە هەیە، موحەببەتێکی فرە ئاساییە

له لایەنێ یا له دوو لایەنەوه هەیه، نه له تەواو لایەنەوه، کەم هەڵئەکەوێ موحەببەتێ لەهەموو ڕووەکانەوه ببێت که هەموو هەست و دەرکەکانی پڕ بکات، ئینسانی به ئیمان، بەو ئیمانه ڕونه، بەو هەست ودەرکه ڕۆشنەوه، به تەواو هێزی مەعنەوی خۆی، خوای خۆی خۆش ئەوێ و بچێ بۆ دیدار لەگەڵیا، ئەچێ عەهد و پەیمان تازه ئەکاتەوه لەگەڵ خوای خۆیدا.

ئەم زاراوه که له زمانماندا هەیه، بۆ نمونه ئەڵێین بەتەواو وجودم هەستی ئەمه ئەکەم یا بەتەواو وجودم فلانه کەسم خۆش ئەوێ، له زۆرینەی کاتدا زیادەڕۆیی تیایه، ناکرێ بەتەواو وجود بێت، یانی بەتەواو بونی مەعنەوی دەرونیەوه که ئینسان هەیەتی، بەلاَم بێگومان ئینسانێ که ئا ئەو جۆره ئیمانەی بێ وا ئێمه ئەیلێین، بەتەواو هێزی مەعنەویەوه ئەچێ بۆ نوێژ، وه بەتەواو هێزی مەعنەویەوه خوای خۆی خۆشئەوێ. ئەنجام نه دیداری فلانه سەرباز که بلێن پێی وەره شا تۆی دەعوەت کردووه خەلاتت ئەکا، نه دیداری دایکێ که بیست ساڵ یا بیست و پێنج ساڵ له کوڕی دوور کەوتبێتەوه، نه دیداری هاوڕێیەك که ماوەیەکی زۆر بێت نەدیبێ، هیچ کام لەمانه قابیلی بەراوردکاری نین لەتەك دیدارێکی ئینسانی به ئیمان که به عینوانی نوێژ بۆی پێش دێ لەگەڵ خوای خۆیدا. ئەم نمونه که وتم شوێنەوارێکی گەوره له ئینسانندا بەگەڕ دەخات، وه تەکان و جموجۆڵێکی پێ ئەدا تا خۆی ئاماده بکات بۆ ئەو دیداره، دایکێ بۆ منالەکەی ڕەفیقێ خۆشەویست بۆ ڕەفیقی خۆشەویستی یا بۆ نمونه سەربازێ بۆ شایەك یا برایەك بۆ برایەك، هەرکام لەمانه له ڕێی خۆیدا، له لایەنێ له لایەنی هێزی دەرونی ئینسانەوه ڕۆڵی هەیه و

تەئسیر ئەکا، بەلاّم ئا ئەو موحەببەتە کە ئینسانی بە ئیمان هەیەتی نیسبەت بە خوای خۆی، لە تەواو لایەنەوەیە، موحەببەتێکە کە هەرچی موحەببەتە پوچە لەبەرامبەریەوە. وەختێك ئینسانێ قەرار بێ بچێ بۆ دیدارێ، بەو جۆرە کە هەرچی دیدارە لەبەرامبەریەوە پووچە و بێ بایەخە، ئەبێ چەنێك ئامادەیی قەلبی پەیا بکات تا بتوانێ لە حالّاتی ئاساییەوە بگۆڕدرێ وەك ئەو نمونەی وتم کە هەرچی دیدارە لەبەرامبەریەوە پووچە. یەك نمونەی واقیعی بچکۆلانە ئەگێڕمەوە:

یەکێ لە کەسایەتیە گەورەکانی بەواتای واقیعی دینی نە بە شێوەی دروستکراو و ساختەکاری، بەناوبانگ بوو بە (عز کوڕی عەبدولسەلام) لە میسر  زیندەگی ئەکرد، هەم بە ئیمان بوو هەم زانابوو، بەو بەلگەیەی ئیمانەکەی خاوەنی حەرەکەت بوو، ئیمانەکەی خاوەنی مەسئولیەت بوو. دەورانی سەلّتەنەتی فاتمی بوو، لەکۆتایی هێز و دەسەلاّتدا فەرمانیان ئەکرد و یاسایان دائەنا بۆ ولاّت. شتێ موخالفی ئیسلام بوایە (عز کوڕی عەبدولسەلام) بەوپەڕی ڕونی و ئاشکراییەوە ئیعلانی ئەکرد بە خەلّکی کە ئەمە پوچە، عەجەب دەردیسەرێکی ساز کردبوو بۆ دەزگای فاتمییەکان. ئەنواع ڕێگایان گرتەبەر لە گفتوگۆ  و دەعوەت و پارە و پلە و پۆستی گەورە، هەرچی شتە هیچ سودێکی نەبوو، لەکۆتایدا پاشای ئەو دەورانە فیکری کردەوە کە هیچ سودی نەبوو، وەلی عەهدی نارد لەتەك چل نەفەر لە سوارە تایبەتەکانی تا بڕۆن قۆلّبەستی بکەن و بیهێنن، هاتن ئیتفاقەن لە مەجلیسدا بوو خەریك بوو وانەی ئەوتەوە، دەرسی زانستی دینی ئەوت بە کۆمەلێ لە قوتابیەکانی. ئەو کاتە هێشتا وای لێ

نەهاتبوو کە خوێندن ئینسان لە کاسبی و زیندەگی دوور بخاتەوە، وەك ئێستە کە خوێندن بە جۆرێکە کە ئینسان دەستی لە دەوروبەری دائەبڕێ، ئەو وەختە وا نەبوو، ئەوانە وا دەرسیان ئەخوێند بە کاسبی جۆر بەجۆر زیندەگیان ئەکرد  لە کەسانی جۆراوجۆر بوون لە گشت جۆرێ. جەماعەت هاتن و بۆ قۆڵبەست کردنی (عز کوڕی عەبدولسەلام)، دوای ئەوەی قسە و ئاڵوگۆڕی بۆچون کرا و هیچ سودی نەبوو، دەسوپایان بەست و بردیان لەتەك خۆیاندا تا دەربار، بردیانە ئەوێ و لە دەربارا پێیان کردەوە، بەڵام هەر بەدەستی بەستەوە بردیان بۆ لای شا، نزیکەی سەعاتێکی پێ چوو تەماشایان کرد بە قیافەتێك تەواو سەربەرزانەوە عز کوڕی عەبدولسەلام گەڕاوە،  لە حاڵێکدا قوتابیەکانی هێشتا هەر لە مەدرەسە لە مزگەوت چاوەڕێیان ئەکرد و پەرێشان بون، خەریك ئاڵوگۆڕی بۆچونیان ئەکرد کە چی بەسەر مامۆستاکەیاندا بێنن. وەختێك هاتەوە قوتابیەکان لە خۆشیاندا نەیان ئەزانی کە چی بکەن! پرسیاریان لێکرد، بێگومان بە تەواو بونیانەوە چاوەڕوانیان بوو بزانن چی پێشهاتووە بۆ مامۆستاکەیان، ئەویش باسەکەی بۆ گێڕانەوە، خاڵێك کە زۆر گرنگە لە فەرمایشتەکانی ئەمەبوو کە خۆی واقعیەتی وت، وتی وەختێ دەست و پێیان بەستم و بردمیان، کەمێ ترسم بۆ دروست بوو، وەختێ بردمیان لەبەرامبەر شاوە وەستاندمیان دووبارە توشی ترس بووم، لە پڕا خوا کەوتەوە بیرم، هەر کە خوا کەوتەوە بیرم، ڕاست بووە دانەیەکی تر لەبەرچاوما، ئەو ترس و لەرزە وا لە ڕۆحما بوو بەدەستی بەستراوەوە گوازراوە بۆ دەرونی شا،  شای فەقیر لەرزە لەرزی پێکەوت بە قودرەتی حەق، بە دەستی بەستراوەوە  لەرزە لەرز ئەخاتە شا، شا  وا

ئەترسێ لە هەڕەشە و قسەکانی، ئاشوفتە و نیگەران ئەبێ و ئەلاڵێتەوە ئەڵێ بۆ خاتری خوا بمبەخشە هەڵەم کرد! قودرەتی ئیمان چ ئەکا! ئەو ئەلاڵێتەوە لە عز کوڕی عەبدولسەلام کە بمبەخشە هەڵەم کرد، بێجام کرد، پەیمان بێت لەمەولا لە هیچ فەرمانێکت دەرنەچم، لە هیچ دەستورێکت دەرنەچم!.

سەرنج بدەن مرۆڤێکی ئاسایی چەنێك سام و هەیبەتی هەیە لە بەرامبەر شایەکەوە کە جەللادەکان وەستاون لەپاڵیدا، یا بەو بارەکەی ترا ئینسانێك ئاسایی بانگی بکەن بڵێن وەرە بۆ دیدەنی شا، چ خۆشیەك دروست ئەبێ بۆی، بەلاّم فیکر کەوتنەوەی خوا لەهەموو ئەوانە بە قودرەت تر و بەهێزترە، چونکە بە فیکر کەوتنەوەی ئەو هەموو شتەکان لەبەرامبەریەوە پوچ بونەوە.

فکری لێ بکەنەوە ئەم ئینسانە وەختی بڕوا بەتایبەتی بۆ دیدار لەگەڵ خوای خۆیدا، بۆ نوێکردنەوەی پەیمان و پیشەی خۆی لە بەرامبەر خوای خۆیەوە، بەواتای بڕوا بۆ نوێژ، بزانە لەو وەختە چ قودرەتێ پەیدا ئەکا، نوێژ بۆ ئینسانی بە ئیمان ئەو تایبەتمەندیەی هەیە. عیللەتی ئەمە کە ئینسان پێویستی هەیە، بەر لەوەی بچێ بۆ نوێژ و نوێژەکەی ئەنجام بدا، ئا ئەم خاڵەیە کە ئیشارەم پێکرد، کە ئینسانێ وەختێ بۆ بەدەستهێنانی شتێ چوو یا بۆ دیدار کەسێ چوو، ئەبێ گۆڕانکاری لە حاڵەتیدا پێش بێت. چونکە بەشێوەیەکی ئاسایی حاڵەتی ئینسان جۆر جۆرە، هەندێ کات هەیە سەرقاڵی مادیە بۆ ئینسان، هەندێ کاتیش سەرقاڵی مەعنەویە، سەرقاڵی مادی یەعنی ئەو شتانەی وا پێویستی جەستە دابین ئەکا،

سەرقاڵی مەعنەویش واتای ئەو شتانەیە پێویستی ڕۆح دابین ئەکا و پێویستی دەرونی ئینسان. ئینسان لە کاتێکدا سەرقاڵی ماددی هەیە بەشێوەیەکی ئاسایی کەمێ دورە لە سەرقاڵی مەعنەویەوە، بەلاّم کاتێك ئینسان سەرقاڵی مەعنەوی ببێ، بە شێوەیەکی ئاسایی کەمێ دورئەکەوێتەوە لە سەرقاڵی مادی، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست لەوە نیە مادی خراپە و مەعنەوی باشە، نا هەردوکیان باشن هەردوکیان هەر پێویست و لازمن، خۆ سەرقاڵی ماددی خراپ و چەپەڵ نالێین، سەرقاڵی مادی موحتەرەم و چاك و مەنتیقی، بەگشتی سەرقاڵی بە هەرکامێکیان کەمێ ئینسان دوور ئەخاتەوە لە ئامادەیی و پەروەرش لەو جۆرەکەی تریان. نمونەیەکی بچکۆلانە دێنمەوە:

یەك نەفەر دانیشتووە خەریکە نان ئەخوا، نان سەرقاڵیەکە جەستەیی(مادی)، پێویستی جەستەیی دابین ئەکا، ئەم کەسە لە کتوپڕا بەحسێك فەلسەفی یا عیلمی زۆر گەورە و گرنگ دێتە پێشەوە، وەکو زانستێك سادە و بایەخێکی گرنگی بێت بەنیسبەت ئەوەوە چونکە نایزانێ، زۆر حەزی پێیە و پەیوەستە بەوەوە حاڵی ببێ، تەماشای حاڵەتی بکەن لەو کاتە تێئەگەن کە دەستی لەو تەمرینە درێژە هەڵگرتووە کە ئامانج بوو لای، یان ئەو خواردنە کە خەمی بوو لای، بەڵکو سەرقاڵی و مەژغەڵەتی بەو زانست و هاوکێشەوەیە و زۆر گرنگ و بەبایەخە، تەماشا ئەکەین لەو کاتانەدا تەنانەت حاڵەتی تیکە جاوین و شێوازی نانخواردنی ئەگۆڕدرێ، ئەمە عیللەتی چیە؟ عیللەتی ئەو تێکچونە دژەیەتی وا لەنێوان سەرقاڵی مادی و مەعنەویدا هەیە، لە حاڵێکدا ئەم ئینسانە ئەگەر وەختێ خەریکە نان ئەخوا قسەگەلی ئاسایی و مەعنەوی بکرێ،

که سەرقاڵی مەعنەوی گرنگ نەبێ، تەماشا ئەکەین بەڵێ نانەکەش ئەخوا تیکەش ئەگرێ و ئەزانێ بەدەم بیجاوێ و ئەزانێ قوتی با و ئەزانێ گوێچکە شل بکا، هەر ئەو بەحسە ئاساییە، هەرچەند گوێ بگرێ ئەهمیەت پەیدا ئەکا و فەعالیەتی ئەم لە نان خواردن لاواز ئەبێتەوە. بۆ نمونە ڕادیۆیەك ئەوەتا لە تەنیشتیەوە، ڕادیۆ مەعلومە کە ئەبیستێ و ئەڵێ، یا تەلەفزیۆنی داگیرساندووە و شتی بێ سەروبەر بلاّوئەکاتەوە، لەتەك نان خواردنەکەیدا  چاوی ها بەتەلەفزیۆنەکەشەوە و گوێچکەشی ها بە ڕادیۆکەوە وخەریکە نانیش ئەخوا، بەلاّم وەختێ هەڵکەوت تەلەفزیۆن بەحسێکی جددی و گرنگی باسکرد، تەماشا ئەکەی یەکسەر فەعالیەتی نان خواردنەکەی کەم ئەبێتەوە، دەنگ بەرز ئەکاتەوە دە هەرا مەکەن دەی منالێ بێدەنگ بن، دەم ئەوەستێ! تەماشا ئەکەی ئا ئەو حاڵەتە وا هەمیشە تەمرینی کردووە، ئەو جوڵەیەی جارانی نامێنی، ئەو دەسە وا چەنێك ئازا بووە لە گرتنی تیکە، چل پەنجا شەست ساڵ بۆ نمونە عومری کردوە، کاری ئەوە بووە تەغزیەی جەستەی خۆی کردوە لەبیری ئەچێتەوە، تەواو زهن و جەستەی ڕووە و ڕادیۆکە ئەبێت، هەتا تەماشا  ئەکەی وردە وردە ترسەکەی نامێنێ و ئەگەڕێتەوە باری ئاسایی خۆی، ئەمە شتێکی سروشتی و ئاساییە. بەلاّم هەندێ جار هەیە کە دەستووری ساختەییە، ئەویش بۆ نمونە وەختێ منالێ ئەچێتە مەدرەسە، ئەڵێن پێیان بەوپەڕی زیللەت و سەرکزیەوە لەبەرسەرماوە زەلیل و داماو بوەستن و سروود بخوێنن بۆ تیکەیەك پارچە شرە. ئەمە بەڵێ دەستوورە، بەلاّم دەرونی ئینسان ئەمە ئارەزوو ناکا، بەلاّم ئەوەی تر کە نمونەم بۆ

هێنایەوە دەستور نیە، سروشتی ئینسان ئەمەیە، ئەوانیش بەم حاڵەتە تەبیعیەوە کە ئینسان هەیەتی، ئەم بەرنامەیان بۆ داناوە کە ئینسان بەشێوەی ساختەگی کۆت و بەند کەن بە کۆمەڵێ ئیحترامات و مەراسمێکەوە، ئەگەر نا بەشێوەیەکی سروشتی ئەمە لە زهنی ئینسانەوە، لە ناخی دەرونی ئینساندا هەیە. ئەو کابرا بێ ئەمە کەسێ پێی بڵێ کە مەتڵەبەکە گرنگە، بە ئیحترامەوە دەی مەخۆ، دەی دەست بوەستێ، دەی بێدەنگ بە وەرە ئەملاوە، ئەمە بێئەوەی کەسێ پێی بڵێ، دەستی لە فەعالیەت ئەکەوێ، دەمی لە فەعالیەت ئەکەوێ، زهنی ڕوو بە تەلەفزیۆنەکە یان ڕادیۆکە ئەبێ، پاشانیش تەواو وجودیشی لایەن ئەگرێ بەرەو تەلەفزیۆنەکە یان ڕادیۆکە، هەموتان ئەمەتانە هەست پێکردووە، ئەمە واقیعیەتە کە ئەم حاڵەتە بۆ ئینسان پێش دێ کە بەو جۆرە سەرقاڵیە مادییەکەی کۆئەبێتەوە بۆ باقی سەرقاڵیەکانیش هەر بەو جۆرە.

دوبارە پوختەی ئەم مەتڵەبە وا وتم بە شێوەی خشتە ئاسا ئەیلێمەوە:

سەرقاڵیە مادیەکان لە لایەنی جیایی لە سەرقاڵیە مەعنەویەکان پلە بەندیەکی جیاوازیان هەیە، هەیانە نزیکە بە سەرقاڵی مەعنەویەوە، هەیانە دوورە، هەر بەو شێوەیەش دوبارە سەرقاڵیە مەعنەویەکان پلە بەندیەکیان هەیە لە جیایی زیندەگی سەرقاڵیە مادیەکان، لە قۆناغێکدا نزیك لەتەك سەرقاڵی مادیدا، لە قۆناغێکدا دورە، خاڵی نێوان ئەم دوانە فەرز ئەکەین بە ئینسان. ئینسان خاڵی نێوان سەرقاڵی مادی و مەعنەویە، لە وجودی ئینسانەوە لایەنێ زهنی وێنا ئەکەین، هەرچی لە ڕێی سەرقاڵی مادیدا ئەڕوێ هەر لە سەرەتاوە لەو خاڵە دوور ئەکەوێتەوە، هەرچی لە

ڕێی سەرقاڵی مەعنەویدا ئەڕوێ له مەبدەئی مەتڵەب دوور ئەکەوێتەوە، هەرچیەك له سەرقاڵی ماددیا دوورتر بکەوێتەوە، لەتەك سەرەتای خەتی سەرقاڵی مەعنەوییا پەیوەندی بەرقەرارتر موشکڵە. ئەگەر له ئیبتیدای سەرقاڵی مەعنەوییا بێ، لەتەك ئا ئەو ڕێیە وا بۆ سەرقاڵی ماددی هەیە له پلەبەندی سەرەتایدا ئیحتمالی جەم بونی هەیە، یا ئەگەر له سەرەتای خەتی سەرقاڵی مادیا هەیە لەتەك خاڵەکانی سەرەتای جیایی لەخەتی سەرقاڵی مەعنەویدا ئیحتیمالی جەمۆ بونی هەیە. قسەکردن ئەمانە بۆ بەهێزکردنی ڕۆح و ڕەوانی ئینسانە، زانیاری زیا ئەکا، دەرك و ئاگایی زیاد ئەکا، بەلاّم بۆ نمونە نان خواردن، ئەو نمونە کە هێنامەوە بۆ دابینکردنی پێویستی جەستەیی ئەو کەسەیە. ئەو کەسەی بۆ نمونە خەریکە نان ئەخوا ئەوەتا لەخەتی سەرقاڵی مادیدا، فەرزئەکەین ئەوەتا له سەرەتای سەرقاڵیدا، بەس وەختی کە بیەوێ له سەرقاڵی ماعنەویدا کەمێ لەو خاڵەی سەرەتا دوور بکەوێتەوە، یانی له قسەکردنی ئاسایی کەمێ دوور بکەوێتەوە و مەتڵەبەکە کەمێ مەعنەویەتی بەهێزتر بێ، ئاگایی زیاتری بوێ، کاریگەری زیاتری بێ لەدەرونی ئینساندا، وردە وردە له فەعالیەتە مادیەکەی کەم ئەبێتەوە، هەروەکو ئەوەی سەرەتا باسم کرد. ئینجا فەعالیەتی مەعنەوی لەتەك فەعالیەتی مادیدا هەڵئەسەنگێنین ، فەعالیەتی مەعنەوی له قۆناغی سەرەتادا، واتە هەر قسەکردنی سادە و ئاسایی هەروەکو ئەوەی خەڵکی هەمیشە خەریکن باسی ئەکەن. یەك نەفەر خەریکە گوێچکە شل ئەکا بۆ قسەیەکی گرنگ، لەو کاتەدا ئەتوانێ نانیش بخوا، بەلاّم ئەگەر کەمێ سەرقاڵیە مادیەکە لەو

سنورە دورتر بکەوێتەوە، بۆ نمونە بیەوێ  غەریزەی جنسی خۆی تێر بکات، لەم کاتەدا تەماشا ئەکەی هەرچیەك لەو لایەنی تێرکردنی غەریزەی جنسیدایە کە ئەویش هەر لەناو خەتی مادیدایەو قۆناغێك دورترە لە خەتی سەرەتاوە، هەرچیەك زیاتر بڕۆیتە پێشەوە لەو خەتە، زهنی ئەمادەگیت کەمتر ئەوێ بۆ قبولکردنی ئەو قسە سادە لە سەرەتای خەتی مەعنەویەتدا، واتە لەخەتی مەعنەویەتدا وا نەڕۆیتە پێشەوە لەخەتی مادیاتدا ئەچیتە پێشەوە، قسە بیستن ئەوەتا لەسەرەتای خەتی مەعنەویاتدا، بەهەمان شێوەش نان خواردن ئەوەتا لەسەرەتای خەتی مادیاتدا، بەمەش هەردوکیان ئەکەونە یەك و نزیکن لەیەکەوە، بەلأم ئەگەر قسەکردن هەر لەجێی خۆیدا بێت، یەکێ قسە بکات و نەفەرێ گوێی بۆ شل بکات، یا ئەم قسە بکات بۆ کەسێکی تر، لەخەتی سەرقالی مادیدا کەمێ بڕۆیتە پێشەوە، واتە شتانێك بێنە گۆڕێ کە زیاتر لایەنی مادی بوێت، وەك مەسەلەی لایەنی جنسی، ئەبینی قسەکردن و تەوەجوهی کەم ئەبێتەوە ، یا قسەکردن خۆی کەم ئەبێتەوە، دوبارە ئەو تاقەت و نیشاتەی نامێنێ، قسەیەکیش پەیوەندی بە مەعنەویاتەوە هەیە تاقەتی نامێنێ، مەتالبێ پەیوەندی هەیە  بە زانینەوە، وردە وردە و سادە سادە تاقەتی نامێنێ، یا تاقەتی نامێنێ  بیبیستێ،  ئەگەیتە جێگەیەك لەخەتی تێرکردنی غەریزەی جنسیدا کە خەتی تێرکردنی پێویستی مادیە فرە بڕۆیتە پێشەوە، ئەگەیتە جێیەك  کە ئەسلەن لەوانەشە گوێچکەیشی حازر نەبێ کەلیماتێ سادەو ساکاریش ببیستێ، غەیر ئەوە کە پەیوەندی هەبێ بە ئەو حالەتی جنسیەی خۆیەوە.

**ئەنجام ئەمەیە:**

لەکاتێکدا ئینسان سەرقاڵیەکی سادەی ماددی ببێ، ئەتوانێ سەرقاڵی و پابەندی سادەی مەعنەویش قبوڵ بکات، بەلاّم هەر لە سەرقاڵی سادەی ماددیا ناتوانێ سەرقاڵیەکی گرنگی مەعنەوی قبوڵ بکات، یاخود بە پێچەوانەوە ئینسان لە کاتێکدا سەرقاڵیەکی سادەی مەعنەوی ببێ، ئەتوانێ سەرقاڵیەکی سادەی ماددی قبوڵ بکات، بەلاّم ناتوانێ سەرقاڵیەکی زۆر گرنگی مادی قبوڵ بکات. دەرونی ئینسان هاوتا نابێت لەتەك حاڵوباری جەستەیدا لە ئەوپەڕی جیایدا، جەستەی ئینسانیش هاوتا نابێ لەتەك دەروندا لەپەوپەڕی جیایدا، لەکاتێکدا پێویستیەکانی جەستە و دەرون زۆر دوور نەبێ لەیەکەوە، کۆئەبنەوە و ئەکەونە یەك، بەلاّم ئەگەر پێویستیەکانی جەستە و دەرون زۆر دوور بن لەیەکەوە ناتوانن کۆببنەوە بەیەکەوە. ئینسانێك کە ئەوەتا لە حاڵەتی سەرقاڵی مادی و مەعنەویدا، بیەوێ بڕوا بۆ سەرقاڵی مەعنەوی، بەشێوەیەکی سادە لەبەر ئەو پێکدادانەی لەنێوان ئەو دوو خەتەدا هەیە کە وەك وتم ناتوانن کۆببنەوە بۆ ئینسان، پێویستی بەوەیە کە کارێ ئەنجام بدا تا ئامادەیی پەیدا بکات بۆ ئەو گۆڕانکاریە، بەهەمان شێوە ئەگەر ئینسانێ لە سەرقاڵی مەعنەویدا بێ، بیەوێ بڕوا بۆ سەرقاڵی مادی، تەماشا ئەکەی ماوەیەکی پێویستە تا بتوانێ خۆی ڕێك بکاتەوە لەتەك سەرقاڵی مادیدا. بۆ نمونە ئینسانێك خەریك کارێکی ئاساییە، یان خەریکی مەسائیلی جنسیە، خەریکە گوێ لە شتێ ئەگرێ کە پێویستیەتی و لایەنی مەعنەوێ پێ بەهێز ئەکات،، ئەگەر بیەوێ بڕوا بۆ جۆرێك لە سەرقاڵی مادی کە زۆر جیایی هەبێ لەتەك سەرقاڵی مەعنەویدا، بۆنمونە بیەوێ کرداری

جنسی بکات، بێگومان یەکسەر ناتوانێ ئەنجامی بدات، ئەبێ پێشەکی و سەرەتایەکی ببێ تاوەکو وردە وردە لەو قۆناغە مەعنەویەوە کە ئەبێ زۆر گرنگیش نەبێ و زۆر سادەسادە بێت، بەهەمان شێوەش ئینسانێك سەرقاڵی مادی پەیدا کردووە، ئەیەوێ بچێت بۆ سەرقاڵیەکی مەعنەوی گەورە گەورە، ئەمیش بەهەمان شێوە ناتوانێ تا کەمێك پێشەکی ئەنجام نەدا و پاشان بیگوازێتەوە لەم حاڵەتەوە بۆ حاڵەتەکەی تر.

دین بەرنامەی داناوە بۆ هەریەکە لەم حاڵەتە مادی و مەعنەویانە، بۆ نمونە ئەڵێ کاتێ ئەچی نوێژ بخوێنی، سەرەتایەك ئەنجام بدە تا ئامادەیی پەیدا بکەی بۆ ئەو حاڵەتە، یان بۆ نمونە کاتێ ئەچی نان بخۆی، یا گرنگتر لەوە لەکاتێکدا ئەچی مەسائیلی جنسی ئەنجام بدەی، پێشەکی و سەرەتایەك ئەنجام بدە تا بتوانی بەشێوەیەکی سالم و باش بەردەوام بیت، کاتێ دین دەستوری پێداوە کە مەسائیلی جنسی ئەنجام بدات، کە جۆرێکە لە سەرقاڵی مادی، دین دەستوری داوە کە ئەنجامی بدا بە جەستە و نەفسێکی سالمەوە تاوەکو وەچەیەکی ڕۆشن و بەرهەمداری بێت، هەتا دەستوری ئەوەشی داوە کە کاتێ لەحاڵاتی مەعنەییەوە ئەگوازرێیتەوە بۆحاڵاتی مادی کە زۆر لەخەتی مەعنەویەوە دورە کە حاڵاتی جنسیە، خێرا ئاژەڵ ئاسا مەڕۆ، سەرەتا پێشەکیەك ئەنجام بدە، چونکە ئەویش لەلایەنی دینیەوە بایەخدارە ئەگەر ئسوڵی و مەنتقی بێت، بەوجۆرەی وتم سەرقاڵی مادی، مەبەست ئەوە نیە کە خراپ و ناپەسەند بێت، واتای ئەوەیە کە پێویستی جەستە دابین ئەکات، ئینسان بە هەرچی شتەوە موحتەرەمە لەلایەنی دینەوە، لەو بازنەشدا پێویستیە غەریزەییەکانیشی، لەبەر ئەوە یاسای بۆ دائەنێ، لە کاتێکدا تۆ ئەوەتای لە سەرقاڵی

مەعنەویداو ئەتەوێ بڕۆی بۆ خەتی مادی، سەرەتا خۆتی بۆ ئامادە بکە، پێشەکیەك ئەنجام بدە کە لەلایەنی جەستەییەوە ئازا و بەهێز بیت، هەم خۆت هەم ژنت، یا ئەگەر ژنە هەم خۆی بەهێز بێت هەم مێردەکەی بەهێز بێت، ئینجا لە لەلایەنی جەستەییەوە بۆ دابینکردنی پێویستیە جنسیەکان ئامادەیی کامڵ پەیدا ئەکەن و کارەکەیان کۆئەبێت و بەرهەمدار ئەبێت، بەم باریشدا هەر بەو جۆرە دەستور ئەدا، کاتێ ئەچی نوێژ ئەخوێنی لەپێشدا پێشەکیەك ئەنجام بدە، هەروەکو چۆن کە وەختێك لە سەرقاڵی ئاسایی زیندەگیدا ئەتەوێ بڕۆی بۆ لای ئەو سەرقاڵیە مەعنەوییە گەورە و گرنگە ئامادەیی کامڵت بێت، ئینسانێك کە ئەڕوا سەرقاڵی مادیەك دور لە سەرەتای خەت ئەنجام ئەدا، ئەگەر لەتەواو لایەنەوە ئامادەیی پەیدا نەکردبێ، ئەگەر فیکری سەرقاڵ بێت بە مەسائیلێکی مەعنەوە کە دوورە لە ئەم سەرقاڵیە مادیە، یا بەسەرقاڵی مادیەك زهنی مەشغوڵبێ کە دور بێت لەم سەرقاڵیە مادیە، بێگومان پەیوەندی لەتەك ژن خۆیدا نا سالمەو پەیوەندی ژن لەتەك مێردەکەی خۆیدا ناسالم ئەبێ، شوێنەواری خراپی ئەبێ. ئینسانیك بەدور لە ئامادەیی پێشینە لە سەرقاڵی مادیەوە، سەرقاڵیەکی مادی کە دورە لە سەرقاڵی مەعنەوی، کاتێ لەو سەرقاڵیە مادیەوە ئەیەوێ بڕوا بۆ گەورەترین حاڵەتی مەعنەوی کە نوێژە، بێگومان ئەو نوێژە بەرهەمدار و باش نابێ، وەك ئەم نوێژانە ئەبێ کە ئەیبینین.

دەستوری ئیسلام لەباسی دەست نوێژدا بۆ دابینکردنی ئەم پێویستیە دەرونیەیە، کاتێك ئینسانێك ئەڕوا بۆ سەرقاڵیەکی مادی، ئەبێ دەرونی

هاوکاری بکات لەگەڵیدا، ئینجا ئەو سەرقاڵیە سەرقاڵیەکی سەحیحە، ئینجا واقیعەن مادیە، ئەڵبەتە بەو شەرتە موحتەرەم بێت، هەر بەو جۆرەش ئینسانیش وەختێ بڕوا بۆ سەرقاڵیەکی مەعنەوی، ئەبێ جەستەی هاوکاری بکات لەگەڵیدا، ئینجا ئەو سەرقاڵیە سەرقاڵیەکی سەحیحەو کاریگەرە و بەرهەمی خۆی ئەبێ، یا بە عیبارەتێ سادەتر وەختێك ئینسان ئەیەوێ هەر جۆرە کارێك ئەنجامبدا، ئاوا سەحیحە بە تەواو بونی واتە هەردوو لایەنی مادی و مەعنەوی، نەك بەتەواو هێز و هەستی مەعنەوی چونکە ئەوە بۆ هەموو کار و جارێك ڕونادات، بەڵکو بەهەردوو لایەنی وجودیەوە ئەنجامی بدات.

دەرون ڕێیەکی هەیە و جەستە ڕێیەکی تر، ئەگەر بیەوێ کارێك ئەنجام بدات کە پەیوەندی بەجەستەیەوە هەیە، ئەبێ دەرونی هەماهەنگ بکات لەو کاتەدا، یاخود ئەگەر بیەوێ کارێك ئەنجام بدا کە پەیوەندی بە لایەنی دەرونیەوە بێت، ئەبێ جەستەی هەماهەنگ بکات، تاوەکو کارەکەی بەرهەمدار بێت. هەر بەو جۆرە مناڵێك کە ئەڕواتە قوتابخانە، زۆر زۆر گرنگە بۆی کە لە وانەکەی تێ بگات و زانیاری پەیدا بکات، چاوپۆشی لەوەی بەرنامەی قوتابخانە هەڵەی تیابێت، بەڵکو مەبەستەکەم زانینە، چونکە خود زانین بۆ ئینسان وەکو هەناسەدان وایە لای گیانداران، ئەوەندە گرنگ و بنەڕەتیە بۆ ئینسان، هەربۆیە زۆر گرنگە مناڵێك کە ئەچێتە قوتابخانە، هەوڵ بدات فێری خوێندنەوە و نوسین ببێت و زانیاری پەیدا بکات، یەکەمین جیاوازی نێوان ئینسان و گیاندارانی ترە، یان یەکەمین مافی سروشتی ئینسانە کە پەیدای ئەکات، مناڵێك ئەگەر تەنها شکڵگیری جەستەیی هەبێ بۆ مامۆستاکەی و گوێچکە شل بکا بۆ

ماموٚستاکەی، بەلاٚم زهنی بەلایەوە نەبیٚ، لەکوٚتایی دەرسەکەدا تەماشا ئەکەی هیچ حالٚی نەبووە و وانەکەش تەواو بووە، هوٚکەشی ئەوە بوو کە ئەم منالٚە لە پوٚلدا پێویستی بەوەیە هەم جەستەیی و هەم دەرونی هەماهەنگ بکات لەتەك یەکدا بوٚ گوێگرتن لە ماموٚستا، تاوەکو زوٚر بە باشی لە وانەکە حالٚی ببێت، چونکە ئەگەر بەتەنها لایەنی دەرونی لەبەرچاو بگریٚ، بوٚ نمونە گوێچکە شل بکا بەلاٚم لەملاوە خەریکی یاریکردن بێت، یان بەجەستە ڕێکوپێك دابنیشیٚ و بڕوانیٚ، بەلاٚم هوٚش و دلٚی لای دەرسەکە نەبیٚ، ئەوا هیچ سودێکی نابێت. بوٚیە بەرژەوەندی ئینسان لەوەدایە هەر کارێك ئەنجام ئەدا، چ کاری مادی چ کاری مەعنەوی، هەردوو لایەن بێت، یانی جەستە و دەرونی هەماهەنگ بێت و ڕێك بخات، نەجەستەی بارێکی بوێت و دەرونی بارێك. ئا ئەم مەتلٚەبە وا دین جەختی لەسەر ئەکاتەوە، کە وەختیٚ ئینسان ئەیەویٚ کاری جنسی ئەنجامبدا چ ژن چ پیاو، ئەبیٚ سەرەتا بەتەواوی ئامادەیی کاملٚیان پەیدا کردبیٚ تاوەکو وەچەکەیان سالم بێت، ئەمڕوٚ لەلایەنی زانستیەوە ڕوٚشن بوٚتەوە، چەند سالٚیٚ لەمەوبەر لە ڕوٚژنامەیەکدا بەرچاوم کەوت، کە وەختێك ئامادەیی جنسی ژن و پیاو تەواو کاملٚ نەبیٚ، گریمانەی ئەوەی هەیە کە منالٚەکە ئیفلیج و کەمئەندام بێت، چونکە ئا ئەو سەرقالٚیە مادیە ئەگەر بەو جوٚرە نەبیٚ کە جەستە و دەرون کاملٚەن لەو کاتەدا هەماهەنگی بکەن، شوێنەواری خراپی ئەبێت، جا فیکری لێبکەنەوە کە سەرقالٚی مەعنەوی گرنگترە، یانی ئەوە کە دەرونی ئینسان بەهێز ئەکات و دەرونی ئینسان پەروەردە ئەکات، چونکە گەرچی ئینسان جەستە و

دەرونی هیچ کامێکیان بەتەنها ئەرزشی نیەو ئینسان نیە، بەڵام ئینسانێ دەرونی نەبێ ئاژەڵێکی تەواوە، ئینسان بە ئەرزشی دەرونی لە ئاژەڵ جیا ئەبێتەوە ، تەنانەت ئینسانێ کە دەرونی نەبێ، یان دەرونی نا سالم بێت، هەزاران جار ئەوەتا لە خوار ئاژەڵەوە. بەڵام ئەگەر دەرونی سالم بێت و باش پەروەردە کرابێت، ئەو کاتە ئەزانی ئینسان مانای چیە! ئەگەر ئینسانێك خەریك دابین کردنی ڕێکخستنی ئەم لایەنە گرنگە بێت لە بونی خۆیدا کە لایەنی دەرونیە، پێویستی هەیە بەمە کە جەستەشی هەماهەنگ بکات. هەماهەنگ کردن پێویستی بە پێشەکیەك هەیە، مەرجی ئەم پێشەکیەش ئەوەیە کە دەستنوێژێك ئەشۆرێ. ئینسانێك کە کۆمەڵێك لە تەئمینی ئیحتیاجاتی جەستەیی بووە، نە لە سەرەتای خەت و نە لە کۆتایی خەت دوور کەوتبێتەوە لە سەرقاڵی مەعنەوی، هەر ئەونە بێت دەم و چاوێ بشۆرێ و دەست و باڵێ بشۆرێ و تۆز و پیسی سەری لابەرێت و قاچ و قولی بشۆرێ، ئەمە ئامادەی ئەکا ئەم میقدارە موقەدیماتە کە ئەنجامی ئەدا لە ئا ئەو حاڵەتە مادییەوە کە پەیوەستە بە دابینکردنی پێویستیە جەستەییەکانی، بگوازرێتەوە بۆحاڵەتی مەعنەوی، وە جەستەشی هەماهەنگی بکات لەتەك دەرونیدا بۆ دابینکردنی پێویستیە دەرونیەکانی.

لێرەوە ئیتر باسی غەسل و ڕوو لە قیبلە کردن و هەڵسان و دانیشتن و حەرەکاتێ کەلە نوێژدا هەیە ڕۆشن ئەبێتەوە بۆ ئێمە، بەس ئەزانین ئەگەر لەخەتی دابینکردنی پێویستی مادیدا زۆر دورکەوتۆتەوە، وەك غەرایزی جنسی، ئەو وەختە بۆ ئەوەی بگەیتەوە ئەوپەڕی خەت و دابینکردنی پێویستیە مەعنەویەکان کە نوێژ خوێندنە، چونکە بەینیان

یەکجار زۆرە و پێویستی بە موقەدیماتی زۆرترە کە ئەنجامی بدات ئەویش ئەوەیە کە تەواو بەدەنی بشۆرێت. سودی بنەڕەتی دەستنوێژ ئا ئەو هەماهەنگکردنی جەستە و دەرونەیە لەگەڵ یەکترّدا، بۆ ئەمە کە لە سەرقاڵیەکی مادیەوە ئامادەیی کامڵی ببێ بۆ گواستنەوە بۆ سەرقاڵیەکی مەعنەوی..

شەریعەتی ئیسلام وای دەستورداوە کە ئەو موقەدیماتی نوێژە بەنەفسمان تەواو ئەوێ، بۆ دابینکردنی سڵامەتی جەستەمان و پاکوخاوێنی زیندەگیمان، بەڵام وەك لەسەرەتاوەباسمکرد، ئەوانە مەتڵوبی ئەساسی دەستنوێژ نین، مەرجی دەستنوێژ ئەمەیە کە ئەو بەشەی دیارە لە جەستە و زۆربەی کات پیس ئەبێ پاکی بکەینەوەو بیشۆرین، وە مەرجی نوێژیش ئەمەیە کە جەستەمان پاك و لیباسمان تەمیزبێ، ئەو شوێنەی نوێژی تیا ئەکەین پاك بێت، ئەمە بێگومان ئەوپەڕی گەورەیی هەیە لەدین و ئیماندا، بەڵام ئەم مەتڵوبە ڕەسمی ئێمە نییە، ئەمە لقێکە لە شەریعەتی ئیسلام لە چوارچێوەی ئەوا کە ئا ئەوە وا پێویستی دەرونی ئینسانە بۆ هەماهەنگ بونی جەستە لەتەك دەروندا بۆ ئەوە کە بگوازرێتەوە لە سەرقاڵی مادیەوە بۆ سەرقاڵی مەعنەویی گەورەو گرنگ وەك نوێژ، بەرنامەیەکی بۆ دائەنێ کە بتوانێ لە ئەم حاڵەتەوە بگوازرێتەوە بۆ ئەوحاڵەتە لە شکڵێکدا ئەم بەرنامەیەی بۆ داناوە کە پێویستە گشتیە جەستەییەکەشی دابین ئەکات، کە پاکوخاوێنی و سەلامەتی و تەندروستیە، بەڵام بەو شێوەیەی کە وتم، ئەو مەتڵوبە یەکەمە کە هەماهەنگکردنی جەستەیە لەگەڵ دەروندا، وە ئەو

پاکوخاوێنی و دابینکردنی سلامەتی و تەندروستیە بەبۆنەی ئەم بەرنامەوەیە تاوەکو سود و قازانجەکەشی ببینن.

ئەگەر ئینسانێ بیەوێ لەحاڵەتی مادیەوە بڕوات بۆ حاڵەتی مەعنەوی، یا لەحاڵەتی مەعنەویەوە بڕوا بۆ حاڵەتی مادی هیچ پێشەکیەك ئەنجام نەدا زەرەری چیە؟

زەرەری ئەوەیە کە ئامادەیی کامڵی نیە، جەستە و دەرون هەماهەنگ نابێ، تا ئەوجۆرە کە ئەو سەرقاڵیە مادیە ئەکرێ باش بێت، یا ئەو سەرقاڵیە مەعنەویە کە ئەکرێ باش بێ و بەرهەمدار بێت. بۆ نمونە یەك سەرقاڵی مادی سادە وەك (نان خواردن)، ئەم مەتاڵبە زۆر لەدونیای ئەمڕۆدا ڕۆشن بۆتەوە، فرەیەك لەفەلسەفەی ئەحکام ئەمەیان کەشف کردووە، کاتێ ئینسان پەرێشان و حەیرانە و لەحاڵەتی گریان و ترسدایە، یا خەفەتی هەیە، نان خواردن باش نیە بۆی، زەرەری هەیە، بەڵام تەماشاکە لە وڵاتی ئێمەدا، ئەمە عورفە زۆر ئەکرێ لەکەسێك کە خەفەتیکی هەیە یا نیگەرانیەکی هەیە یا ترسێکی هەیە کە نان بخوا، لەحاڵێکدا مەسڵەحەتی نیە، چونکە ئامێری هەرسکردنی (گەدە) ئامادە نیە بۆ ئەوە! ئەوە بۆ؟! چونکە حاڵەتی دەرونی هەماهەنگی ناکات لەتەکیدا؟ بەو جۆرە ئەو ئینسانە تا سەرەتا حاڵەتی دەرونی یارمەتی نەدا و لەگەڵ خواردندا هەماهەنگی پەیدا نەکات نەکا کە بتوانێ ئەوبەرنامە مادیە ئەنجام بدات، ئەوخواردنە زەرەرە بۆی، هەروەك ئەو نمونەیە کە بۆ یەك سەرقاڵی ماددی گرنگتر کە غەریزەی جنسیە، وەك باسمکرد کە ئیحتمالی ئەوەی هەیە وەچەکەیان دوچاری کەمئەندامی ببێت، وەختێ کە ژن و پیاو ئامادەیی کامڵیان نەبێ. هەر بەو جۆرەش بۆ

بەرنامەی نوێژ، وەك باسمكرد ئەگەر پێشەكیەكی باش ئەنجام نەدا ناتوانێ جەستە و ڕۆحی هەماهەنگ ببێت، كاتێكیش جەستە و دەرون هەماهەنگ نەبوو بۆ دابینكردنی پێویستی جەستە، ئینسان دوچاری زەرەر ئەبێ، بۆ دابینكردنی پێویستی دەرونیشی دوچاری زەرەر ئەبێ و سودی نابێت.

# حیکمەتی ڕۆژوو

پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) لەباسی ڕۆژودا ئەفەرموێ کە زۆر ڕۆژوەوان هەیەهیچ سودێك لە ڕۆژووەکەی دەست ناکەوێ، غەیری تینوێتی و برسێتی. بۆچی؟! چونکە دەرونی خۆی هەماهەنگ نەکردووە لەتەك ئەو بەرنامەیەی کە ئەنجامی ئەدا، وەختێ ئیمکانی هەیە ڕۆژوو سەبر و بەهێزی و ئارامی و بەرگری بەئینسان بدا، کە ئینسان بەو ئاگاییەوە و بەو ئامادەییە دەرونیەوە بیەوێ ڕۆژوو بگرێ.

ئەگەر ئینسانێك بەو ڕۆحیەوە دەست نەکا بەڕۆژوو، بەڵکو هەروا کە عادەت ئەیخوازێت یا لەبەر لاسایی کردنەوە و چاو بڕین لە ئەوانی تر، لە بەشێکی ڕۆژدا نان نەخوات، لەتەك وەعدەکە گوزەریا ئیترحەیوانێکە، یا لەکاتێکی ترا بەو جۆرەی ئەو بەرنامە نەبێ، ئەگەر ژەمێك خواردنی لێ ببڕن، بلێن فەرموو تەسلیم ببە بەوە، ئەگەرنا نانت پێنادەین، ئازا ڕۆحیەت خۆی لەدەست ئەدا.

نمونەیەکی بچکۆلانە ئەگێرمەوە ئەڵبەتە بۆ ئینسانێ کە ئەو ئەهلی ڕۆژوو نەبوو، چەند ساڵێ لەمەوپێش کە لە تاراندا زیندەگیم ئەکرد، زیندەگیەکی تەواو حەیوانانە و خراپم بوو، سەرقاڵی جۆر جۆرم بوو، جۆرێ دینداری سەرپێیانەم بوو، بۆ نمونە ڕۆژوم ئەگرت و نوێژم ئەخوێند، بەلاّم نە بەو شێوازە واقیعیە، زۆر زۆر سەرپێیانە بوو، بۆ نمونە وەك ئینسانێ لەحاڵ گیان کێشانابێ نە مردوەو نە زیندوە، نوێژەکەم نە ئەوە بوو نوێژ نەبێ، وە نە ئەوە بوو نوێژ بێت، هەر بەو جۆرە شتێك بوو لەو بەینەدا. بەلاّم کاتێك لە کارەکەم حاڵی بوم، بەوە

دڵخۆشی خۆمم ئەداوە قەیناکا بەس نیە من سەنەد نانوسم و زیادە لەخەڵك ناسێنم، بەڵام لەوەو دوا تەماشام کرد باجگیرخانەیەکە، ئێوە منالْن لەبیرتان نیە زوتربوو لەم وڵاتە هەبوو، وەختێ تێگەیشتم دەفتەر ئەسناد ڕەسمی هەر بەو جۆرە باجگیرخانەیە وێڵم کردو ڕۆشتم. بەهەرحاڵ لەو دەفتەرە ئەسنادە ڕەسمیەدا ئەفرادێك بونە هاوڕێم لەوێ کاریان ئەکرد، یەکێ لەوانە گەنجێك بوو، کارکەر و خوێنەوار، ئاشنایی لەگەڵ مندا پەیدا کرد و ئەهاتە ئەوێ کاری ئەکرد. کاری ئەکرد و خوێندنەوەشی هەبوو، بەڵام بەداخەوە ڕێی خوێندنەوەکەی لادەرانە بوو، دوچاری بیری مادیانە ببوو، یانی ئەو ئەرزشە واقعیە ئینسان ئەبێ دەرکی بکات و خۆی پێ بناسێ، ئەو پێچەوانەی ئەوە ئینسانی ناسی بوو، بەکورتی باس و موناقەشەمان بوو پێکەوە، ئەو بەو بیرەی خۆیە و منیش بە مەعلوماتێ شپرزە و دەرونێکی ناسالمەوە. لەبیرمە کە ڕەمەزان هات، وتم ئەرێ هاوڕێی ئازیزم نەهاتیتە سەر ئەو ڕایەی ئەم ڕەمەزانە بتوانی ڕۆژویەك بگری؟! دەستی کردە فەلسەفە لێدان، ئەو فەلسەفە ماتریالیستیە کە ئینسان ئەکاتە حەیوانی تەواو، بە میقداری غەزایەك کە ئەگەیتێ بەو میقدارە ئینسانە، میقدارە غەزاکەی لێ بستێنە، ئینسانیەتی دێتە خوارەوە، دروست وەك حەیوانێکیتر، پەرواریێك چەندێ غەزای پێئەدەی، ئەوەنە گۆشتی لێ ئەسێنێ، عەینەن بەوجۆرە لە ئینسانیش ئەنوارن. میقدارێ باسمکرد لەگەڵیدا، بەڵام بەداخەوە ئەو مەتاڵیبەی قبوڵ نەکرد و ڕەمەزان هاتە پێشەوە، من ڕۆژوم ئەگرت بەڵام ڕۆژویەك بە ئەو شێوازە سەرقاڵیە پیسە مادیەوە کە بوم، وە بە ئیفتار و

پارشێویێکەوە کەلە ڕێی بازگیرییەوە ئەمخوارد، بەلاّم بەهەر حالّ ئارەزووم ئەوەبوو کە ڕۆژوو بگرم. ئەو ڕەمەزانە مەبەستم ئەوەبوو ڕۆژویەك ئیسلامی بگرم، لە ئیفتارەکاندا تەواو کەم بخۆم، پارشێویش تێر نەخۆم، بەلاّم یەکێ لە کاریگەریەکانی ئەوەبوو کەدوای ڕەمەزان تێگەیشتم، ئەو دلّەکزەی سالاّن هەمبوو نەماو چاکەوە بوم، ئێستاش ئەمەم کردۆتە بەرنامە بۆ زۆرینەی ئەو کەسانەی کە دکتۆر پێیان ئەلّێ ڕۆژوو مەگرن و ترسناکە چونکە دلّەکزەیان هەیە و ئازاری گەدەیان هەیە، من تەنها ڕۆژویان بۆ دیاری ئەکەم، بەو مەرجەی ڕۆژوی ئیسلامی بێت. ئیمکانی نیە ڕەمەزان تەواو ببێ ئەو ئینسانانە گۆڕانکاریان بەسەردا نەیێت، هەلّبەتە ئەمە ئەساسی ڕۆژوو نیە، بەلّکو ئەمە یەکێ لە سودەکانی ڕۆژووە، بەهەرحالّ من ئەو ڕەمەزانە ڕۆژوی وام تەعین کردو بۆخۆم خاس گۆڕیام، لەکاتی ڕەمەزاندا شەوێ خەبەرم نەبویەوە پارشێو بەو ئیفتارە تەواو کەمەوە واقیعەن فرە کەم و سادە بوو، تەقریبەن لەتە نانێکیش لەوە ئەچێ کەمتر بەپەنیر وماست و ئەم جۆرەشتانەوە ئەمخوارد، ڕۆژوی خۆمم پێ درێژەدا، کاتێ وەختی ئیفتار هات، خێزانم خوا عەفوی بکا داوای لێمکرد وتی چونکە دوێنێ شەو پارشێوت نەخواردوە ئەم ئیفتارە باش بخۆ ئیشکالّی نیە، وتم نەوەلاّ پارشێو نزیکە بەرنامەی خۆم ناگۆڕم قەیناکا، هەر ئیفتارێ تەقریبەن نانەکەی خۆم خوارد، دوبارە پارشێو خەبەرم نەبوەوە، هیچ ئیتر وەختێ خەبەرم بوەوە تەماشا ئەکەم هەوا ڕۆشنەو کات گوزەریاوەو نوێژم کردو کەوتمە ڕێ بۆدەفتەرخانە، فەعالیەتی دەفتەر یەکجار زۆر بوو، ڕۆژێ لەوانە بوو دە تا دوانزە سەنەدمان وارید دەکرد. ئەمەم بۆ خۆم حەلاّلّ کرد و ئەوانەی

وا لە بانکی میللی قەرزیان ئەسەند، چونکە زۆربەیان قەرزاری و دەستکورتیان بوو، بە بۆنەی ئەوەوە ڕزگاریان ئەبوو، ئەوەم کردبووە تەئویلێ بۆ خۆم کە ئەمە قەیناکا حەلاڵە، بەهەرحاڵ بەلاّم ئەساسەن باجگیری بوو، ئەسنادێ زۆرمان ئەنوسی کە زۆربەیان ئەسنادێ بانکی میللی بوو، وە هەندێ لەو ئەسنادە بانکی میللیە لەسەدیان سی تا چلیان قەرز بوو ئەنوسرا، کاری یەکجار زۆر بوو. کاتی نیوەڕۆ هەمیشە سەعات ١٢ بۆ ١٢:٣٠ دەفتەرمان دائەخست، بەلاّم ئەو ڕۆژە هەندێك هاتبون و کاریان تەواو نەببوو کاتەکە درێژەی کێشا بۆ سەعات ١:٣٠، کاتێ ئەوان ڕۆشتون و تەواو بون، هاوڕێکانم کە بەڕۆژوو نەبون، چون بۆ نانخواردن، ئەو هاوڕێیەم کە وتم بیرێکی مادیگەرایی بوو، بەرلەوەی بڕوات، زۆر گلەیی و بۆڵە بۆڵ ئەمانە کە ئەمە چ جۆرە ژیانێکە؟ تا ئێستا ئێمە چاوەڕێ بکەین و نان نەخۆین و ئەمە چۆن ئینسان نارەحەت نابێت و توشی برینی گەدە نابێت و ئەم جۆرە قسانە. هیچ ئەوان ڕۆشتن بۆ نان خواردنی خۆیان و منیش هەستام هەر لە نوسینگە شوێنی دستنوێژ و بەرماڵ و شتم بردبوو ژورێکی گەورەشمان هەبوو، جێ هەبوو دەستوێژم شۆردوو نوێژێکم کردو تا ئەوان نانیان خواردو چاییان خواردو هاتنەوە پشویەکیشمدا، دوای ئەوە هەستام کە هەستامەوە دووبارە کار دەستی پێ کردەوە، کار دوبارە زۆر درێژەی کێشا، نزیکەی لەوانەیە دەقیقەن بە بیرم بێت دوو سەعات تا سێ سەعات لە کاتی بەربانگی من درێژەی کێشا، کە من مەجالی ئەوەم نەبوو تەنانەت دانەیەك شیرینی بخۆم لەباتی بەربانگەکەی خۆم، تا نوسینگە چۆڵ بوو هاوڕێکانم خۆیان ئامادە کرد کە

بچن بۆ نان خواردن، ئەو هاوڕێ زۆر خوێنەرەی من دووبارە هاوارو بۆڵە بۆڵی بەرز بوەوە، زۆر توندتر زۆر سەختر لە نیوەڕۆ زۆری وت، قەیناکا بە ئاگایانە ناوی ئەڵێم یادی بەخێر چونکە کێشەیەك نیە ڕوداوێکە زۆر قسەمان پێکەوە بووە (ئاغای ئیبراهیمی موحەممەدیان)، وابزانم ئێستا دادوەرە و وا لە تاراندا، خەڵکی ئەم دەوروبەرەی شار بوو، کەسێکی خوێنەواربوو خوێندنەوەی زۆر بوو، بەڵام هەر بەو جۆرەی باسم کرد خوێندنەوەیەك کە بیری مرۆڤ ڕووناك ناکاتەوە، بەڵکو بیری تاریکترو شپرزەتر دەکات، چونکە یەکەمین هەڵەی ئەوەیە کە خۆی ئەکاتە حەیوانێك و خۆی بەقەت حەیوانێك ئەناسێ، بەڵێ بەهەرحاڵ ئەم هاورێیە بۆڵەو هاواری لێ بەرز بوەوە، زۆر جنێو و کوفری کرد، کە ئەم ژیانە ناخۆشە چیەو ئینسان سەلامەتی خۆی و وزەی خۆی لەدەست بدات چیە؟ وەڵا تیکەیە نان بەدەست بهێنی یا دوو قران پول بەدەست بێنی؟ ئەمە چ کۆمەڵگایەکە ؟ ئەمە چ مەملەکەتێکە و ؟ ئەمە چ وەزعێکە؟ وتم برا ئەزانم زۆر برسیتە زۆر ناڕەحەتی، دابنیشە با من بەسەرهاتی خۆمت بۆ بگێرمەوە، جا دوای ئەوە ئازادی، وتی کوڕە ئاخر برسیمە ناڕەحەتم! وتم ببورێیتەوە ناهێڵم ئیمکانی نیە چونکە هاوڕێیەتیمان خۆش بوو، بە بەهەرحاڵ ئەیتوانی لەبەر هاوڕێیەتی ئەوەم لێ قبوڵ بکات، دانیشتوو دەستم کردە قسەکردن لەگەڵیان و وتم ئاغای موحەممەدیان من و تۆ ئێستا کاممان بەهێزترین بۆ کارکردن؟ وتی: وەلا تۆ، وتم دەی کاممان خواردنی زۆر لە لەشماندایە؟ وتی: دیارە کە من، وتم ئاخر نازانی چۆن! تۆ با تۆزێ ڕونکردنەوە بەم جارجار ئەهاتەوە بۆ بەربانگ کردنەوە بۆ ماڵ خۆمان، وتم خۆ ئەزانی من بەربانگ چەنێك خواردن ئەخۆم؟ وتی:

بەڵێ، وتم دوێنێ شەو پارشێو خەبەرم نەبۆتەوە، بەربانگێکم هەر بەو بەرنامە ئاساییەی خۆم خواردووە، دوبارە پێرێ شەو خەبەرم نەبۆەتەوە بەربانگم هەر بە بەرنامە ئاساییەی خوم خواردووە، من لەم ماوە درێژەدا دوو دانە ئیفتارم خواردووە، کە ئەزانی چەنێکەو ئەشزانی لەڕووی جەستەوە من بەهەیکەلترم لە تۆ، من زیاتر پێویستم بەخواردنە تا تۆ، وتم ئەمە هوکارەکەی چیە؟ ئێستا تا بەیانیش دانیشین وگاڵتە بکەین و خۆشی بکەین و یاری بکەین و بچین بۆ گەڕان و تاقەتت هەبێت زۆران ئەگرین و ڕابکەین لە کەژوکێوا تاقەتم هەیەو هێزم تیایە، بەڵام تۆ تا ئێستا خەریکی ئیرادەی خۆت لەدەست ئەدەی، خەریکە لەپێ ئەکەوی، خەریکە هەڵئەچی و سەکتە بکەی لەبەر خاتری برسێتی، وتم خۆ ئەزانم ڕاست ئەکەی ئەو هەموو هاوارو دادەت بەخوا لەوانەیە ئەگەر سەعاتێکی دیکە کارت درێژەی بکێشایە لەوانەیە سەکتەت بکردایە لەبەر برسێتی، وتم ئەزانی هۆکارەکەی چیە؟ وتم هۆکارەکەی ئەوەیە تۆ بەجۆرێك خۆت ئەناسی منیش بەجۆرێك، تۆ خۆت بە حەیوانێك ئەناسی یەکدانە دەرەجەت داناوە بۆخۆت بۆ پێوانەی خۆراکی خۆت، ئەگەر لەو پێوانەیە داتناوە بۆ خۆت خواردنت کەمێك هاتە خوارەوە ئیرادەو بوون و هەرچی شتە لەدەستی ئەدەی، بەڵام من خۆم وا ناناسم خۆم بە شتی باشترەوە خەریککردووە کە زۆر گرنگترە لە خواردن، خواردن گرنگە بۆم، بەڵام لە پلەی دووەمدا، لەبەرئەوە من ئاوا بەهێزو بەتاقەتم، توش ئاوا لاواز و بێ توانای، ئیتر هەنێك قسەی سیاسی هاتە پێشەوە، کەسێکی حەماسیش بوو حەماسەتی زۆرتر بوو لە کرداری، لە ڕاستیدا خەیاڵی زۆریشی ئەکێشاو

ئەمانە هەنیك شت كە مرۆڤ خۆشی لێئەهات، وتم جا كاكە گیان ئا ئێستا من یەك بەسەرهات لەو بەسەرهاتانە  كەوا باس ئەكرێت و ئارەزووی ئەكەیت و ئەمانە ئەیهێنمە پێش چاوت كە لە كۆتایدا سودی لێ ببینی.

وای دائەنێین من و تۆ شەڕمانە لەگەڵ دوژمنێكدا، وە هەریەكەو سێدانە كولێرەمان پێیە، دوژمن گەمارۆی لەسەر داناوین، هەریەكەو تەنها سێ دانە كولێرەمان پێیە، ڕێیەك نییە خواردنمان پێ بگات، هیچ هەولێكیشمان پێ نادرێ بۆ خواردن لە هیچ لایەكەوە، تۆ تا چەند ڕۆژ بەرگە ئەگری؟ وتی: ڕەنگە ڕۆژێك بەرگە بگرم،  وتم خۆت و شەرافەتت من تا چەند ڕۆژ بەرگە ئەگرم ؟  وتی: وەلا بەم حسابەی كە من دیومە ئەم دوو سێ ڕۆژە كە بەو جۆرە تۆ پارشێوت نەكردووەو  ئەو ئیفتارەی كە تۆ خواردووتە ڕەنگە پێنج شەش ڕۆژ بەرگە بگری، وتم جا براكەم بیركرنەوەی كاممان باشترە؟ كاممان ئینسانێكی باشترو بەهێزتر دروست ئەكەین ؟ وتم ئەم بیركرنەوەیەی تۆ ئینسانێكی حەیوان ئاسا، لاواز، سەرشۆر، بێ ئیرادە دروست ئەكات كە لەگەڵ خواردنی كەم بوو خۆراكت لێ سەندەوە، بەهەر شت و داواكارییەك تەسلیم بێت، بەلاّم ڕێگای بیركردنەوەی من یەكەم تاقەت و بەرگری ئینسان زۆر زیاتر ئەكات و هیوای مرۆڤ زۆر زیاتر ئەكات، دووەم وا ئینسان ڕائەهێنێ  كە گرنگی جەستەیی و مادی مرۆڤ بچوكە و تەسكە ئەتوانی بە ئاسانی لێی دەرباز ببیت، ئەتوانێ چونكە شتی گرنگتر  لە جەستە و لە پێویستیەكانی جەستەدا هەیە، ئەگەر ببینی لەت لەت و پارچە پارچە بكرێیت و لەبەچاوی خۆیەوە پارچەكانی بسوتێنن لەبەر ئاگردا، هێشتا لەبەر گرنگیە گەورەترەكە خۆی بەدەستەوە نادات و هەر پایەدار ئەمێنێ، بەلاّم

تۆ ئەو شتە گرنگەت نیە هەر جەستەکەت و پێداویستیە مادیەکەتە، لەبەر ئەوە  ئاساییە و حەقتە تۆ لەبەرامبەر پێویستیە مادیەکەت نەتوانی سەرفە نەزەر بکەیت و چاوپۆشی بکەی، حەقتە بۆ پێداویستی مادی کەمتر لەو پێوانەیەی کە خۆت داتناوە بگاتە دەستت و ئیرادەت لەدەست بدەی، بەلاّم من حەقمە کە هەرچەند  پێداویستی مادی دەستەبەر بێت بۆم هەر بەهێزو بەئیرادەو بەرگریکار بم. لەبەر ئەوە ڕۆژوو و یا نوێژ یا هەرکام لەمانە داواکراوێکە نە لەبەر خۆی لەبەر سود گەلێك کە هەیەتی، ڕۆژوو بەو شێوەیەی کە باسم کرد ئەبێت ئەو ئازایەتیە بدات بە ئینسان  ئەو خۆراگری و ئیستیقامەیە بداتە ئینسان کە ئینسان فێربێت لە کاتی ئازادی ڕەهادا نیعمەت گەلێك کە هیچ ڕێگریەك نیە، هیچ کێشەیەك نیە، بە تەنها لەمانە سود وەربگرێت، لە مەسائیلی جنسی،  لە خواردن لە خوادنەوە، بتوانێ بە ئارەزووی خۆی چاو پۆشی بکات، وە بە ئەو دیدو مەعریفەتی ئەم ناسینە، ئەم ئیسنانە ئەگەر توانی بە مەیلی خۆی لەوپەری ئاگایی و ئازادیدا چاوپۆشی کرد، لەم سێ پێویستیە (ئارەزووی جنسی، خواردن، خواردنەوە)، ئائەم سیانە کە گرنگترین و سەرەکیترین پێویستی جەستەیی مرۆڤن، لەکاتی ئاسایدا خۆی ڕاهێنا کە وابەستەی ئەمانە نەبێت، ئەگەر کاتێکی نائاسایی بۆ هاتە پێشەوە ئا لەمانە بێبەشکرا دەست نەکاتە گریان، وەك هەندێك لە هاوڕێی لاوازم  هەر لەناو زیندانندا لە(قزل قلعە) دیومە ئەگریان بۆ ژنەکەیان، لەبەرئەوەی بەڕاستی حەیوانێك بوون، نەیان ئەتوانی بێ ژن بژین، ئەگریان بۆ ئەوەی کە بەشەخواردنەکەیان کەمە، کە خواردنەکەیان

سارده، ناخۆشه، بەدڵیان نیه، ئا ئەمە ڕاستیەکە کە بە چاوی خۆم دیومە هاوڕێی خۆم دەستی کردووەتە گریان لەبەر خاتری ئەوەی کە بیری ژنەکەی کردووە ، یا لەبەر خواردنەکەی، حەقییەتی هەمووشتێکی ئەو ژنەکەی و خواردنەکەیەتی، بۆیە ئەگری، ئومێدی لەدەست ئەدات کاتێك نەبێت، بەڵام مرۆڤێك لە بیرکردنەوەو ئاگاییدا بێت وا نییە هەموو شتێکی ژنەکەو خوادنەکەی بێت، با ژنەکەو خواردنەکە نەبێت شتێکی سەروتر هەیە، ئەو شتە سەروترە گرنگترە لە هەمووشتێك، گشت شتێك دەکاتە قوربانی.

کاتێك بیناو گرنگی عیبادەت بۆ ئینسانی موسڵمان ئاوابێت ئەو شێوازەی کە تۆ باسی ئەکەی چۆن ئەکری ئەنجامێکی هەبێت؟ وەك ڕۆژوی هەندێك خەڵکی لێ دێت، هەرلەکاتی بەڕۆژوبونەکەدا، لەبیری ئەوەدان کە خیانەت لەخەڵك بکەن و دزی بکەن و درۆبکەن، کابرا نوێژ ئەکا، بەڵام چونکە لەڕووی ئاگایی و ئەو شێوازەوە نیە، وەك ئەو بەرنامەو یاسایە نیە، هەر لەکاتی نوێژەکەیدا لەبیری ئەوەدایە چۆن پارەکانی کۆبکاتەوە، بێ ڕۆح ئەبێت توێکڵێکی بی ناوك ئەبێت.

ئەم دینە هەندێك شێخ و مەلای بێ دین و دین فرۆش دروستیان کردووە و داویانەتە دەست خەڵك، ئەو جۆرە عیبادەتە کە ئینسان لە سەرقاڵبوونی بە مادەوە ڕاستەخۆ بچێت دەست بکات بە پێداویستیە مەعنەویەکان، نە کاریگەری نابێت بۆی ئەو سودەی پێ ناگەیەنێ، هەروەك ڕەفتاری ئەو حەیوانەی لێ دێت کە بەناو ئینسانی موسڵمان ئەنجامی ئەدەن، لەکاتێکدا ئەبینی نمونەی ناموسڵمانین. موسڵمان چۆنە ئەمان ڕێك پێچەوانەی ئەوەن کە ڕەفتاری ئینسانی موسڵمان پابەندی

مرۆڤی موسڵمان ئەبێت چۆن بێت، ئەمان ڕۆژوو و نوێژیان هەیە، بەڵام سەیرئەکەی هەمیشە غرور و خوبەزلزانن، لە یەکەم ڕیزی مزگەوت دائەنیشن، بەڵام لە ڕاستیدا ڕێك پێچەوانەی مرۆڤی موسڵمانن لە هەڵسوکەوت و ئاکاردا. ئەبێت نوێژ یا ڕۆژوو یا هەرکام لەم کردەوانە کاریگەری هەبێت بۆ دروستکردنی کەسایەتی ئینسان، بۆ دروستکردنی ئیرادەی بۆ سەبر و تاقەت پێدانی لەبەرامبەر مادە، ئەمە داواکراوە ئەگەرنا ئەمە فەرمودەیەکی پێغەمبەرە(صلى الله عليه واله وسلم) کە دەفەرمێت : ﴿مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ اَلزّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ، وَالْجَهْلَ، فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ فِي أنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ[1]﴾، واتە: (ئەگەر کەسێك لە قسەو ڕەفتارە خراپەکانی دەست هەڵنەگرێ، خوا چ پێویستیەکی بەوەیە کە خۆراك نەخوات، یا ئاو نەخواتەوە، چ کارێکی پێی هەیە). ئەگەر لە ڕوی ئەو بیروباوەڕەوە نەبێ کە باسمکرد، ئەخلاقی ئینسانی ئیماندار تایبەتمەندی دەرونی بێ ئاگایانەی مرۆڤی ئیماندار لەژێر نوری مەعارفێکە کە لە دەرونی ئاگاداریدا جێ ئەگرێ و ئەبێت پەروەردە بکرێ. پەروەردەکردن واتە هەندێك زانیاری ڕاست و دروست سەبارەت بە ئینسان، سەبارەت بە ئەرکی، سەبارەت بە وەزیفەی، دەربارەی ئایندەی، دەربارەی چارەنوسی، بدرێت پێی لەدوای ئەو ئاگادارییەی کەسایەتی پەروەردە بکرێت. کاتێ لەو ڕووەوە ئینسان تێگەیشت کە چ کارەیە؟ تێگەیشت بۆچی نوێژ ئەکات؟ بۆچی ڕۆژوو ئەگرێ؟ هەرگیز ناتوانێ لەوپەڕی سەرقاڵبوونی بە مادەوە کە لە خەتی مادەوە زۆر دورکەوتۆتەوە، بتوانێ بێتە ئەوپەڕی هێڵی

[1] صحيح البخاري/ ١٨٠٤

مەعنەوییە، هەروا کە باسم کرد هەرگیز ئینسانێك کە لە سەرقاڵی مادیەوە کە لە خەتی مادییات زۆر دورکەوتۆتەوە، بێت بۆ سەر دەرسێکی گرنگ یا بۆ گفتوگۆیەکی فەلسەفیانە و گشتی زۆر گرنگ، مومکین نیە ئامادەیی وەرگرتنی ببێت، قەت سودی لێنابینێت، کاتێك مرۆڤ سود وەردەگرێ  لەو شتەی کە دەیەوێ، جەستەو ناوەڕۆکی بۆ ئەو شتەی کەدەیەوێت پێکەوە بگونجێنێت جا چ پێویستی مادی بێت یا مەعنەوی.
لەبەرئەوە کە ئینسانێك خەریك بووە ئارەزووی جسمی تێرکردووە، کە ئەمە سەرقاڵیەکی مادیە، جەستەو ناوەڕۆکی شێوەی ئەوەی گرتووە ئێستا کە ئەیەوێت بێت بۆ سەر پێویستیەکی مەعنەوی زۆر گرنگ، کە لە گفتوگۆو و دەرسی زانستی زۆر گرنگترە، زۆرتر ناوەڕۆکی ئینسان بەهێز دەکات، ناوەڕۆکی ئینسان زۆرتر سودمەند ئەبێت لەم جۆرە پێویستیە مەعنەویە تا لە دەرسێك، چونکە زۆرکەس ئەناسین مرۆڤی خوێنەوار و قوتابی زانکۆ بەلاَم بۆتە ژەهر و میکرۆب بۆ کۆمەلگا و بۆ مرۆڤایەتی. سودێك کە مرۆڤ لە نوێژ وەریئەگرێت وەك سودێك نیە کە مرۆڤێکی خوێنەوار لە باسێکی زانستی گرنگ  یا لە گفتوگۆیەکی فەلسەفی گرنگ وەریدەگرێت، سودوەرگرتنی ئەو زانایە لەو زانستە کاریگەرییەکی سنورداری هەیە لە ژیاندا، بەلاَم سودوەرگرتنی کەسێکی ئیماندار لە نوێژ کاریگەری بێسنورە لە ژیانیدا.
ئەم مرۆڤە ناتوانێ لەو حاڵەتە مادیەوە بێت بۆ ئەم سودوەرگرتنە مەعنەویە بچوکە، ئەو چۆن ئەتوانێ لەو حاڵەتە مادیەوە بێت بۆ ئەم سودوەرگرتنە مەعنەویە گەورەیە؟ بەبێ ئەوەی کە گۆڕانکاریەك ئەنجام بدات ؟ ئەمە لە بونیاتی دروستبوونی ئینسان دورە! تایبەتمەندی مرۆڤ

ئەمە بوو کە ناسیمان، لە هەر کات و کارێك و خەتێکا بێت بیەوێ بچێتە سەر کارێك لە ئەو خەتەی تردا، بەبێ دوودڵی و گومان ئەبێت هەندێك گۆڕانکاری بکات تا جەستەو ناوەڕۆکی هەردووکی پێکەوە ئامادە بێت بۆ ئەو مەرحەلە، ئەگەرنا ئەگەر ڕۆی سودی لێ نابینێت، جا چ پێویستی مادی بێت بەو شێوەیەی کە باسمکرد، خوادن ئەگەر ئینسان ئامادەیی نەبێت بۆی کاریگەری نەرێنی ئەبێت بۆی، جەستە ناساغ ئەکات، چونکە جەستەو ناخ پێکەوە هەماهەنگ نەبوون، هەروەها کاری جنسیش لەکاتیکدا ژن و پیاو تەواو ئامادە نەبن لەوانەیە وەچەکەیان شەلەل و کەمئەندام بێت، دوچاری چەندین کەم و کوڕی بێت. هەر بەو شێوەیە پێویستی مەعنەوی چ دەرسێك بێت، چ گفتەگۆیەکی فەلسەفی بێت، چ نوێژێك بێت کە لە هەردوکیان گرنگترە ئەگەر لەوپەڕی ئامادەبووندا نەبێت لە هەماهەنگی تەواوی جەستە و ناوەڕۆکدا نەبێت کاریگەری خۆی نابێت.

لە تایبەتمەندی جۆرییا وەك باسمانکرد مرۆڤەکان جییاوازییەکیان نییە گرنگ تایبەتمەندی کەسییە جییایان ئەکاتەوە، بۆ حەیوانات تەنها تایبەتمەندی جۆری گرنگە . هەر لە سەرەتای ڕونکردنەوەکەوە ئەوەمان وت کە ئینسانەکان بەڵێ لەڕووی تایبەتمەندی جۆرییەوە هاوبەشن هەڵبەت جگە لەوەی کە جەستەی یەکێکیان لاوازتر بێت یا بەهێزتر بێت یان یەکێکیان خوێنەوار بێت و یەکێکیان نەخوێنەوار بێت بەڵام بەگشتی لە تایبەتمەندی جۆرییا وەك یەکن بەڵام تایبەتمەندی کەسی جییایان ئەکاتەوە، وە لە ئینسانیشا ئەم تایبەتمەندییە کەسییە گرنگترە نەك

تایبەتمەندییە جۆرییەکە  چونکە بەمەیان مرۆڤ ئەگاتە هێلی خراپی تا لوتکە یا ئەگاتە  هێڵی باشی تا لوتکە. وەك هەر لە سەرەتاوە وتم مرۆڤەکان وەك یەك نین لەئاست تایبەتمەندی کەسیەوە، بەلاَم لە ئاست تایبەتمەندی جۆریەوە تەقریبەن.

- ئایا ئەو جەستەیەی کە ئینسان هەیەتی کانگای ناوەڕۆکی نیە؟

- پەیوەندی لەنێوان جەستەو ناوەڕۆك، وەك پەیوەندیەکە لە لەنێوان وزە و لەگەڵ ئەو گڵۆپە یا تەلی کارەبایە، نەوەك ئاوێك لەناو زەرفێکدا، هەڵبەتە ئەمە چواندنێکە بۆ تیگەیشتنی شێوەی جیگیربوونی پەیوەندی. جێگیربونی شتێك لەناو شتێکی دیکەدا  بەیەك شێوە نیە، چەند جۆرێکی جییاوازی هەیە، بۆ نمونە هێزی بینین لە چاودا، وەك گەرمی لە جەستەدا، دەرونی مرۆڤ  لەناو جەستەی مرۆڤدایە، بەلاَم  یانی چی وا لەجەستەی مرۆڤدا؟ واتای ئەوە نیە فلاَن خاڵی دیاریکراو کە ئەتوانی ئەو خاڵە لابەیت نا، جۆرێك جێگیربوونە لەگەڵ جەستەیا شیاوی دیاریکردن نیە، وەك ئەوەی بڵێت ئەوە بەشێکە لە جەستەو ئەوە بەشێکە لە دەرون، وەك ئەوەی ئەگەر ئاوێك قاپێکی تێدا بێت، خەتێکی پێدا بێنیت و بڵێیت ئەوە بەشێکە لە قاپەکەو ئەوە بەشێکە لە ئاوەکە، ئا بەو جۆرە نیە. بەڵکو جۆرە ڕێکخستنێکە تەواو تێکەلاَو، چەند بەشێکی تێکەلاَو تەواو با لەیەك ناتوانی جیایان بکەیتەوە، بەوبۆنەوە هەر کاتێك ئەتەوێ  پێداویستی جەستەیی دابین بکەیت، ئەبێت لەگەڵیدا دەرونیشت هەماهەنگ بکەیت، هەرکات ویستت پێداویستی دەرونت دابین بکەیت، ئەبێت جەستەشت لەگەڵیدا هەماهەنگ بکەیت، چونکە تێکەڵن بەیەکەوە، وەك جیگیربونی شتێك لەناو شتێکی دیکەدا نیە، وەك ئاوێك

لەناو زەرفێکدایە ئەیهێنین بۆنمونە ڕەنگی ئەکەین، پێویست ناکا زەرفەکە ڕەنگ بێت، یا ئەتوانین ئاوەکە بێنینە دەرەوە لەجێیەکی دیکە ئاوەکە ڕەگ ئەکەین و ئەیکەینەوە ناو زەرفەکە، بەو جۆرە نیە! لەوانەیە ئەوە ببێت، بەڵام پێویستی جەستە بەبێ هەماهەنگی لەگەڵ دەرون نابێت، لەبەر ئەو پەیوەندیە زۆر تێکەڵاوەی کە جەستەو ناوەڕۆك هەیانە پێکەوە، ئینسان هەمیشە ئەبێت هەوڵ بدات بۆ پاراستنی هەردوولایان، بەڵام بەو شێوەیەی کە وتم.

- لەسەر پێویستی جەستەو دەرون، هەر بۆنمونە ئە و کارگەیەی کە غاز بەرهەم ئەهێنێ، ئەگەر دەستکاری بکەین بەو شێوەیە کارەبا کەمتر سەرف بکا!

- وانیە! هەر لە سەرەتادا نمونەیەکم هێنایەوە، ئیتر با نەبێتە گفتوگۆیەکی زهنی، نمونەیەکی بەرچاو ئەهێنمەوە، بۆنمونە (گاندی و شەعبان بێمۆخ ) کامیان لەڕوی پێداویستی مادی و خواردنەوە بەهێزتر بوون؟ کامیان زیاتر ئەگەیشتە جەستەیان؟ سودی زیاتر ئەگەیشت بەجەستەیان؟ دەی کامیان بەهێزتر بون لەڕوی ئینسانیەتەوە ؟

- نا ئەوان جیاوازی کاتی و شوێنیان هەبوو!

- باشە ڕاستە، بەڵام بەگشتی نمونەکەی تۆ بەتاڵ ئەکاتەوە، ئەمە هەڵە بوو ئەم پێشنیارە کە هەرچەنێك پێداویستی جەستەیی ئامادەبێت، بەو پێوانەیەش دەرون بەهێز دەبێت، ئەمە ڕەت کرایەوە، چونکە شەعبان بێمۆخ لە گایەك گاترە، پوچترە، هیچترە، لەکاتێکدا کە ئەگەر گاندی بونمونە شەعبان بێمۆخ پەنجەیەکی لێ بایە ملی ئەپەڕی! سەری با

ئەیبرد! ئەزانین ئەو مرۆڤە گەورەیە بوو بەنیسبەت  هەر بە نیسبەت ئەیلێم،  نالێم بێ عەیب بوو بێ کەموکوڕی بوو بێ هەڵە بوو لە فەلسەفەیا، لە تێگەیشتنی فیکریدا بێ پەڵە بوو، کەموکوڕی و هەڵەی زۆر بوو، بەلاَم بۆ بەراورد ئەم دوانە ئەهێنینەوە بە نمونە کە ئەو لەڕوی ئامادەیی پێداویستی جەستەییەوە  دەر سەدی چەنێك بووە، ئەم چەنێك بووە؟ بەلاَم لەڕووی سودی مرۆڤایەتیەوە، لەڕووی هێزی دەرونیەوە دەرسەدی ئەم چەنێکە دەرسەدی ئەو چەنێکە؟ ئەوە باسم کرد دوای ئەوەی کە بە هاوڕێکەمم وت (محمدییان) لەڕوی باسی بیرکردنەوەی مادیەوە  ئەوە ڕاستە کە ئێمە پێوانەیەك دانێین و بڵێین ئینسان تا کۆتایی ئەم پێوانەیە  پێویستی بە خواردنە، بەلاَم یەك تۆز لەو پێوانەیە بهێنینە خوارەوە، بەو نیسبەتە توانای کەم ئەبێتەوە، تەواوی قودرەتی کەم ئەبێتەوە  لەڕووی بیرکردنەوەی مادییەوە بەڵێ ڕاستە، چونکە هەروەك شتێکی مادی باسی ئەکەین، بەلاَم باسم کرد لەڕووی بیرکردنەوەی دینیدا کە مادەو ماوەرای مادە هەردووکی بەیەکەوە ئەبینێ وە ئەزانی ئینسان تێکەلەیەکە لە مادەو پشتی مادە ئەم پێشنیارە هەڵەیە، بەڵێ ئەکرێ کەسێك تا کۆتایی ئەو دەرەجەیە خواردنی بدرێتێ، لەشەرانیترین حەیوان شەڕانیتر بێت، بەلاَم کەسێکیە لە نزمترینی ئەو دەرەجەیە خواردنی هەبێت بەهێزترین کەس بێت، ئەو بۆچونە زۆر هەڵەیە، ئەو بۆچوونە مادییە هەڵەیەت بردۆتە بیرتەوە.

من و تۆ ڕۆژێك دانێین تۆ  خواردنی تەواوی خۆت بخۆ، منیش بەزمانی بەڕۆژووەوە، حەزئەکەی وەرە زۆران بگرین  یا مەیدانێك دانێ کە تیایدا هێزی ئینسانی دەربکەوێ  کە تۆ وائەزانی مادییە یا هەرجۆرێکی پێ

ئەڵێیت، سەیر ئەکەی من بەهێزترم لە تۆ. چونکە بەو بیرکردنەوەیەی کە تۆ هەتە بۆ ئینسان بەدەرەجەی خواردنی گرنگی ئەهێنیتە خوارەوە، گایەکەی شەعبان بێمۆخێکە! بەلاّم ئەو بیرکردنەوەیەی کە من هەمە وانییە خواردن گرنگی نییە بۆی، لەوانەیە کەسێك  لە سەرەتا تا کۆتایی ژیانی یەك دەهەمی ئینسانێکی تر خواردن بخوا، بەلاّم هەزار بەرامبەری ئەو مرۆڤ بێت، ئەو کەسەکەی تر دەبەرامبەری ئەم خواردنی خواردبێت، بەلاّم سودێکی نەبێت بۆ مرۆڤایەتی.

- سەبارەت بە دەستنوێژ گرتن، ئەگەر کەسێك  دەست یا دەموچاوی نەشوا چی ئەبیّ؟

- ئەوە بوو کە باسمکرد، بۆ ئینسانێك کە بەو شێوەیەی کە ناسیمان نوێژ بکا  نە حەیوانێك بێت بڕوا نوێژ بکا، حەیوان نوێژ بکا بەکەڵکی نایەت.

- نا مەبەست ئەوە نییە.

- ئاخر دەی ئەمە هەر ئەبێتەوە بەوە کە ئەڵێیت دەستنوێژ نەشوا،  باشە بڕیار ئەدا نوێژ بکات، بەلاّم هیچ پێشەکیەکی ئەنجام نەداوە،  ئەم ئینسانە بەو جۆرە کە باسمکرد  لە سەرقاڵی مەعنەویەوە بچێت بۆ سەرقاڵی مادی، ئەبێت هەندێك شتی سەرەتایی ئەنجام بدات، تا لەو سەرقاڵیە مادییە لەحاڵەتێك کە جەستە و دەرون هەماهەنگ بوبێت و کاریگەری باشی هەبێت، هەر بەم جۆرە  ئەم ئینسانە لە سەرقاڵی مادی دور لە مەعنەویەوە بیەویّ بێت بۆ سەرقاڵی مەعنەوی، ئەبێت هەندێك شت ئەنجام بدات تا جەستە و دەرونی هەماهەنگ بێت بۆ ئەم کارە و وە کاریگەری و بەرهەمی باشی هەبێت، نمونە سادەکە ڕونی کردەوە ئەو

ئینسانه كه له مەسائیلی جنسیەوه بیەوێ بێت بۆ یەك گفتوگۆی گرنگ یا گفتوگۆیەکی فەلسەفی گرنگ، ئایا بێ ئەوەی هیچ پێشەکیەك ئەنجام بدات ئەتوانێ بێت و بیری ئامادە بێت و بتوانێ سودی لێ وەربگرێت؟ دیارە كە ناتوانێ، ئەبێت هەر شتێکی سەرەتایی ئەنجام بدات هەرچیەك بێت.

- ئەگەر جەستە پێویستی پێی هەبێت ئەتوانێت.

- جەستە پێویستی نییە بە زانین، کەر جەستەی لە ئینسان گەورەترەو پێویستی پێی نییە، دەرون زانینی ئەوێ بۆ هەڵە ئەکەی؟ کەر زۆر لە ئینسان گەورەتەو نایەوێ بچێتە قوتابخانەو دەرس بخوێنی، ئەمە دەرون و ڕوانی ئینسانە، هەر بەو جۆرە دەرونی ئینسانە نوێژی ئەوێ نەك جەستەی، هێشتا ڕون نەبۆتەوە كە مرۆڤ جییاوازی هەیە لەگەڵ حەیواندا، بەوەی کە هەستێکی هەیە لەناو ئەمدا لە ئاژەڵەکانی تردا نیە، ئەو هەستەش پەروەردەکردنی ئەوێ، نوێژو ڕۆژوو ئەمانە بۆ پەروەردەکردنی ئەم هەستەیە، خوێندن هەر بۆ پەروەردەکردنی ئەوە، زانین هەر بۆ پەروەردەکردنی ئەوە، ئەمە پەیوەندی بە جەستەوە نیە، ئەم پێویستیە كە مرۆڤ هەیەتی بە نوێژ هەروەك پێویستییە بە زانین، ئەگەر ئینسانێك لە سەرقاڵی مادییەوە بیەوێ بێت بۆ سەرقاڵی مەعنەوی کە پەیوەندی بە زانینەوە هەیە، یەك گفتوگۆی گرنگی فەلسەفی بێ دودڵی لە حاڵەتی جنسیەوە ناتوانێ بێتە سەر ئەم حاڵە، تا هەنێك گۆڕانکاری ئەنجام نەدات. دین ئەمە لە ئینساندا ئەناسێ و بە موحتەرەمی ئەزانێ، وە حوکم بۆ ئینسان دائەنێ بەو بونە کە هەیەتی و بەو ڕاستیەی کە هەیەتی، بەو پێیە بەرنامەیەکی بۆ دائەنێ کە لە

سەرقاڵی مادیەوە بێت بۆ مەعنەوی، ئەبێت پێشەکی هەندێك شت ئەنجام بدات جا با پێشەکیەکە وابێت کە سودێکی بۆ سەلامەتی و پاکوخاوێنی ببێت، ئەگەرنا خۆ ئەیتوانی شتێکی کە دانێت لەباتی دەستنوێژ، بۆ نمونە جوڵەیەکی تر ئەنجام بدات، بەڵام شتێکی بۆ داناوە کە سودی گشتی هەبێت، وەك شتنی دەم و چاو گوێچکە و سەر و دەست و پا با ئەمە هەمیشە پاك بێت، ئەسڵی داواکراوەکە ئەوەیە ئەو پێویستیە دەرونیەی وا ئینسان هەیەتی کە بگۆڕێت لە حاڵەتی مادییەوە بۆ حاڵەتی مەعنەوی، ئەبێت هەنێك کار ئەنجام بدات، کە جەستەو دەرون هەماهەنگ بکات، بەڵام ئەو ڕۆحییەتەی لە ڕوویەکەوە داناوە کە سودی تریشی هەبێت، وە ئەم پێشەکییە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ هەمیشە پاك و خاوێن و لەش ساغ بێت، لەبەر خۆی و لەگەڵ خەڵکدا هەمیشە ئەگەر پاکوخاوێن بێت زەرەری بۆ خەڵك کەمە، وە ئەگەر بە تێکەڵی لەگەڵ خەڵکدا کەمێك پیس بێت، بەهۆی دەست نوێژەوە پاك ئەبێتەوە، وە بە بۆنەی نوێژەوە بەگشتی شوێنی ژیان و جەستە و جلوبەرگی هەمیشە خاوێن ئەبێ.

- واتە ئەگەر دەستنوێژ نەشۆری ئیتر خاوێن نیت؟

- مەسەلە هەر پاکوخاوێنی نییە، لە سەرەتاوە باسمکرد، داواکراو هەر پاکی نییە، بەڵام داواکە وا کراوە کە پاکییەکەشی تییا بێت، ئێوە بیرتان چووەتەوە کە وتم هەنێك مەلا ئەڵێن کە مەبەست لە دەستنوێژ و نوێژ پاکوخاوێنیە، وتم ئەوە فێڵە، گرنگی گەورە ون ئەکەن و گرنگی بچوك ئەهێڵنەوە، وە گرنگی مەعنەوی ون ئەکەن و گرنگی مادی ئەهێڵنەوە. لە

**ڕاستیدا ئەمانە فێڵ لە گرنگی مادی ئەکەن،  ئەمە بەڵێ گرنگیەکە بۆ دەستنوێژ یا نوێژ، بەلاّم کرنگیەکی لاوەکیە گرنگیە سەرەکیەکە ئەوەیە کە باسمکرد.**

# حیکمەتی نوێژی بە کۆمەڵ

- واجب بونی نوێژی جەماعەت تا چ ئاستێکە؟!

- لەڕوانگەی ئەم پرسیارەوە پێویست دەکات لەدیدگایەکی فراوانەوە تەماشای ئەم مەتڵەبە بکەین، سەرەتا مەفهوم و تێگەیشتنمان لە نوێژ و نوێژی جەماعەت ڕون بێت جا پاشان ئەم بابەتە تاووتوێ بکەین.

لە ئیسلامدا نوێژ پەیوەندیەکی بەردەوامی ڕۆحیە لەنێوان ئینسان و بەدیهێنەری خۆیدا، لەوەو دوا بەرنامەی عەمەلیەی زیندەگی خۆی لەو وەرئەگرێت، بۆ باشتر ڕابیتە دروست کردن لەگەڵ خەڵکیدا.

نوێژ پەیوەندیەکە لە بەینی ئینسان و خوای گەورەدا، ئەم بەرنامە کە لە لایەنی خواوە دێت بۆ ئیدارەی ئینسان، بۆ ئیدارەی فەرد بە شێوەی فەردی نییە بەڵکو بە تەوەجوهی بە تەبیعەتی واقیعی ئینسان مەوجودێکی کۆمەلایەتی و شارستانیە، پەیوەستیشە بەمەوە کە ژیانێکی خۆش بژی، هەربۆیە بەرنامەیەکی گشتیشە بۆ تەواوی کۆمەڵگا.

لەناو باقی گیاندارانیشدا نمونە گەلی لەم جۆرە زۆرەو ئەبینین کە کۆمەڵە گیاندارێ هەن لە حەشەرات و گیانداری بچوك و گەورە بە کۆمەڵ ئەژین، وەك مەسەلەن مۆریانە یان هەنگ ، یا وەك کۆمەڵێ گیانداری گەورەتر، کە ئەگەر کۆمەڵەکەیان فراوان و گەورە بێت لەشێوەی کۆمەڵگایەکدا دێتە بەرچاو و هەرچی بچوکتریش بێت لەشێوەی خێزانێکدا دەبینرێ، ئینسانیش هاوشێوەی گیاندارانی تر و بەشێوەی کامڵتر دەبینرێ کە زیندەگی خاوەنی ڕێگای جۆراوجۆرە کە بەتەنیا ئیدارە ناکرێ و ئیحتیاجی هەیە بەمە کە بە شێوەی گروپ بێت و بەهەموشیانەوە

کۆمەڵگایەك پێك بێنن. ئەگەر وابێ باشترین فێربونێك بۆ هەر ئینسانێ ئەوەیە کە بتوانێ بەشێوەیەکی کامڵ پەیوەندی خۆی لەگەڵ هاوڕێ و دۆست و تەواوی ئەندامانی کۆمەڵگاکەیدا ڕێك بخات.

نوێژ ئەو بەرنامە فێرکاریەیە کە ئینسان بە خواوە پەیوەست ئەکات، جا ئەگەر ئەم نوێژە بتوانێ ئینسانەکانیش بەیەکەوە پەیوەست بکا، تەرتیبێ وا لە مرۆڤەکاندا بەدی بێت بە دەستەجەمعی هەوڵی چارەسەری ئەو کارانە بدەن وا تاکەکان و کۆمەڵگا پێویستیانە ئەوا ئەو ئامانجە بەدی دێنن کەوا ئیسلام هەوڵی داوە لەڕێگای نوێژی جەماعەتەوە خەڵکی لەدەور کۆبکاتەوە.

لێرەدا نمونەی کۆمەڵگایەکی ئیسلامیت بۆ وێنا دەکەم تاوەکو تێبگەی کە نوێژی جەماعەت چەندە کاریگەری هەیە لەسەر لایەنی ژیانی واقیعی ئینسانی موسڵمان.

موسڵمانان کۆمەڵە خەڵکێکی دیاریکراو بوون لەچەند چینێکی کۆمەلآیەتیدا ئەژیان، بەشێوەیەکی گشتی و زۆربەیان هەژار و مسکێن بون، یەکە یەکەیەکیان نەبێ لە مامناوەند و دەوڵەمەندان بون، وە یەکە یەکەیەك لە موترەفین مابون کە هێشتا نوقمی ئەوە نەبون کە ئیتر بەهۆی بەدەست هێنانی ئیمتیازی زیاترەوە ژیانی کەسانی خوار خۆیان نەبینن و ڕەنگی ئەشراف و زیادەڕۆکانیان نەگرتبوو، یەکەیەکەیان پێشوازیان لە حەق ئەکرد و پەیڕەویان لێئەکرد.

کۆمەڵگەی ئیسلام تا نزیکەی ١٣ساڵی پێغەمبەرایەتی موحەممەد(صلی الله علیه واله وسلم) بارودۆخی بەم جۆرە بوو، واتە کۆمەڵگایەکی واقیعی و تەندروستانە نەبوو، وردە وردە چەند دیمەنێکی مەعنەوی و

پەیوەستیەكی مەحكەم و فراوان لەنێوان تاكەكانی ئەم جامیعەیا دروست ئەبوو كە فەعالیەتی ئەیا بە ژیان و زیندەگیان، یەكگرتوییان لەبەرامبەر ئەشراف و گەورەیانی قورەیشەوە زۆر بەهێزتر ئەبوو لەگەڵ ئەوەی ڕێگەیان نەئەدا موسڵمانان بە ئازادی بتوانن لە شوێنێكدا كۆببنەوە، ئا لەم بارودۆخەدا كە چ جۆرە فشار و زەختێك لەسەر موسڵمانان بوو كە كاتێكی زۆری پێویستە تا بە شێوەیەكی سەربەخۆ تەعریفی بكەم و خەڵك بتوانێ بیناسێ و زیندەگیان ڕۆشن بێ بۆ ئێمە، ئا ئەم ئەفرادە هەر جارە و هەوڵیان ئەدا لە شوێنێكدا كۆببنەوە و پێكەوە نوێژ بخوێنن، جا باشترین فرسەت شەو بوو، ئەزانین كە ئێستەش غالبەن تاریكی شەو بۆ ئینسانەكان باشترین فرسەتە بۆ فەعالیەت گەلێ كە لەناو كۆمەڵگەدا ڕێگەپێدراو نیە، جا چ فەعالیەتی خەیر چ فەعالیەتێ شەڕ.

پەندێكی عەرەبی ئەڵێ:"الليل أقصى للويل"، كەسانێ بەرنامەیەكیان هەیە لە كۆمەڵگادا ناتوانێ قبوڵی كات و جیاوازە لەگەڵ زەوقی كۆمەڵگە ، وە ئەم بەرنامە عەمەلەن ئەبێ بلاّوببێتەوە، تاوەكو لایەنی عەمەلیەت بەخۆی بگرێ، یەكەمین پەناگە بۆ ئەوان شەوە، هەروەكو یەكێ لە شاعیرانی كورد تەعبیر لەبارەی شەوەوە ئەكات و ئەڵێ:

گەر پەنای چاتر ئەوێ بۆ ئەو دووە بڕوانە شەو

شیعرەكە فرە زەریفە و مەتڵەب فرە زەریف لەبارەی شەوەوە بەیان كراوە، واقیعەن ئەوە بوو كە ئەوان ئەیان توانی لەم مەوقیعی شەوە ئیسفادە بكەن بۆئەوەی جار جار جەمەوە بن و نوێژ بەیەكەوە بخوێنن، برێ وەخت ئیجتیماعەكە گەورەتر بوو ماڵ یەك نەفەر لە مسوڵمانان لە

دووری شارەوە قەراری گرتبوو مسوڵمانان لەملاو و لەو لاوە ئەیان توانی بچن. ماڵ ئەرقەم کە ئێستەش لە مێژوودا مەشهورە (دار الأرقم)، یەکە یەکە موسڵمانان بەو پەڕی بەرپرسیارێتی و مەترسیەوە هەڵەسان لەملاو لای شاری مەککەوە جەم ئەبون، ئەچون لەماڵی ئەرقەم بەیەکەوە جەماعەتی نوێژیان ئەکرد. یەك عیبارەتێ هەیە، ئێمە لە نوێژدا وەختێ هەڵەسینەوە بۆ ئیعتیدال ئەڵێین: "سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ"

هەرکام لەمانە، ئەمە ماجەرای فرە جانبێکە کە زانینی تەئریخ حەیاتی ئیسلام میقدارێ ڕۆشن ئەکاتەوە بۆ ئێمە، وە کەیفیەت و نەشئەت و پەرەسەندنی ئەم دینە لە ناو کۆمەڵگە، تا گەیشتوە بەوەزعێ کە بتوانێ گۆشەیەکی گەورە لەم جیهانەدا ئیدارە بکات.

لە ماڵی ئەرقەم بەو هەموو فشارەوە لەسەر موسڵمانان هەبوو کۆببونەوە، حەزرەتی ئەبوبەکریش هاوەڵی گیانی بەگیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) کە بە ماڵ و هەرچی ئەرزشدارە فیداکاری ئەگا لەڕێی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم)و بەرنامەیدا، ئەویش ڕێیەکی پەیدا کرد بۆ خۆی لە تاریکی شەوا، خۆی گەیاندە ماڵی ئەرقەم و بەرنامەیان دانابوو پێشتر وەختیان بۆخۆیان دیارکردبوو کە مەخفیانە بڕۆن لەماڵ ئەرقەم جەم بن بۆ نوێژ.

فشار فرە بوو، لە چاوەڕوانی ئەوەدا کە موەفەق بوون ئەم بەرنامەی خۆیانە پێشکەش بکەن، وەختێ حەزرەتی ئەبوبەکر هات و وارد بوو، چونکە ئەو موشکیلە و حاڵەتانە بە جۆرێ بووە باعس ئەمە درەنگتر بگا،

چ ببینیٚ ! بەڵێ جەماعەتیٚ فرە لە مسوڵمانان لەناو ماڵی ئەرقەم جەمۆ بوون و خەریکن نوێژ ئەکەن و پێغەمبەریش(صلى الله عليه واله وسلم) ئیمامەت ئەکا و ئەو موسڵمانە گیان لەسەر دەستانەی کە یەکەیەکیان بوو لەژێر مەڕاحیلی موختەلیفی زەجر و ئەشکەنجەیا، توانیان لە تاریکی شەو ئیسفادە بکەن و هاتن بۆ ئیقامەتی ئەم شیعارە کە سادە نیە.

گەورەیانی قوڕەیش (ئەشرافەکان)، حەقیان بوو بترسن لەم نوێژە و لەم شیعارە، چونکە ئینقلاب بوو نسبەت گشتەوەو هەموو شتێکی ژێر و بان ئەکرد، ئیمتیازاتیان، ئەشرافیەتیان، قودرەتیان، ماقوڵیەتیان، حورمەتیان، هەرچی شتە... کە تەشەری گەورەیان لە موحەممەد (صلى الله عليه واله وسلم) ئەوە بوو کە ئەیان وت: "گەورە و بچووکی لەبەین بردوە، ئیحترام و ئەدەبی لەبەین بردوە" یانی چی ؟!

یانی ئەو گەورە و بچووکی و ئیحترام و ئەدەبە وا ئەشرافیەت دروستی کردبوو، وە ئەگەر کابرای ماقوڵ هەزار جوێن بداتە حەماڵێك عەیب نیە بیٚ عەیبە، بەڵام ئەگەر حەماڵەکە وەڵام بداتەوە و بڵێ ئەوە بۆچی ئەوەنە جوێن ئەدەی؟! نەك جوێنەکەی پیٚ باتەوە، ئەڵێن عەجەب بیٚ ئەدەبێکە ئا ئەم جۆرە ئەدەبە!

بەڵێ ڕاستیان ئەکرد پێغەمبەر گشت ئەمانەی ورد کردو لەبەینی برد و داغانی کرد، ئەوانە بەو ئەدەبەوە زیندەگیان ئەکرد، زیندەگی موترەفین و ئەشرافەکان ئیحتیاجی بەو جۆرە ئەدەبە بوو، بەو جۆرە نیزامە بوو، بەم دەلیلە ئەوان بە نسبەتیٚ زیندەگی خۆیان و ئیمتیازاتی خۆیان مەنتقی بوو کە هەوڵبدەن نەیەڵن ئەم نوێژە ئیقامە بکریٚ.

موشكیلاتێ فره لەڕێی ئەبوبەكردا بوو، ئاخری گەیشت، تەماشا ئەكا، بەڵێ تەواوی ئەم مشكلاتە، ئیجتماعێ نسبەتەن گەورە لە مسوڵمانان جەمن و خەریكن نوێژ ئەخوێنن،

ئەمە كە ئەو كەلامە لە تەرەف خواوە هاتوە، وە حەیاتی داوە بە ئەوان بیخوێننەوە و دەوری بكەنەوە، هەرچیەكی نازڵ بووە لەتەرەف خواوە بیخوێننەوە و دەوری بكەنەوە، هەم،شارەزاییەك پەیدا ئەكەن لەحزوریا، هەم نەفسی خۆیان و ڕەوانی خۆیان پەروەردە ئەكەن لەسەر ئەو مەنهەج و بەرنامە وا لە تەرەف خواوە هاتووە، زیاتر پەیوەست ئەبن نسبەتەن بە بەرنامەی خواوە، بەو پەیمانەی دابویان هەرچی شتیانە فیدایان ئەكرد لە ڕێیا و ئەو پەیمانە لە وجودیانا لە ڕوانینیانا قەوی تر ئەبێ و ڕیشەدار تر ئەبێ، مەحكەم تر ئەبێ بە دەوركردنەوەی قورئان، بەرنامەیان زیاتر ئەمە بوو، وە ركوع و سجودێك، ئەعمالێك كە غالب هەر لەوانیشا هەر قورئانیان تلاوەت ئەكرد، لە وەختێكا حەزرەتی ئەبوبەكر دەرگای كردەوەو ئا ئەم مەنزەرەی بینی، ئەم هەموو فشارە كەچی موسڵمانان بەم جۆرە توانیویانە لێرە جەمۆ بن و پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم) ئیمامەت ئەكا و باقی تریش وەهان و ئەوەتان لە حاڵەتێكا كە ئیتر ئیمتیازات و شیرك و بت پەرستی و ئەشرافیەت ورد و داغان ئەكەن ، هان لە حاڵەتی ڕكوعدا، یانی ئیقرار بەمە كە حەقێ بەرنامە ڕێزی و گەورەیی تەنها بۆ خوایە، عەجەب حاڵەتێكی بە عەزیمەتە...!

عەجیب عەزەمەتێك ئەداتە ئینسان ڕكوع، وە لەوە موهیم تر سجود لە بەرامبەر خواوە، عەجیب فێرە ئەوەی ئەكا كە ئیتر سەربەرز بێ لەبەرامبەر هەرچی شتی ترە بێجگە لە خوا، بەتەنها لەبەرامبەر خواوە

فێره بەندەگی و ئیتاعەت ببێ، وە ئازادی پەیدا ئەکا ئیتر تەبیعەت بەندەگی و ئیتاعەی بۆ غەیری خوا نامێنێت، ئا لەم حاڵەتە بەعەزەمەتە، ئا لەم حاڵەتی کبریائە کە ئیتر تەخت و بەختی قورەیش و باقی حکومەتەکانی دونیا ئەلەرزان و داغانی ئەکرد. ڕکوع لەبەرامبەری خواوە، یەعنی داغان بوون لە هەرچی قودرەتی ترە، ئا لەم حاڵەتە حەزرەتی ئەبوبەکر ئەم جەماعەتەی بینی، لەزەتی ئەو مەنزەرە بە هەیبەت و جەلالەتە ئەوەنە کاری کرد لە دڵیا، لەرێگە وەختێ وارد بوو لەئەعماق قەلبیەوە شوکرانەی خوای بەجێهێنا و وتی: "الحمدلله رب العالمین"، ئەم سەرکەوتنە گەورەیەی لەم کۆمەڵەوە، لەناو ترسەکانی مەرگەوە توانیویانە و عبوریان کردوە و هاتوون ئەم ئیجتماعە تەشکیل ئەکەن، لەم حاڵەتە پڕ عەزەمەتە "سمع الله لمن حمد" لە زار پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه واله وسلم) هات، بۆ؟!
وەختێ حەزرەتی ئەبوبەکر شوکری خوای بەجێهێنا لەبەرامبەر ئەم حاڵە پڕ عەزەمەتە، وەحی ئیلاهی گەشت بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه واله وسلم) کە ئا ئەم حەمدە وا لە دڵەوەهات، وا ئەونە دڵسۆزانە بوو لە ئەعماق قەلبەوە، گەیشتە خوا و ئەرزشی پەیدا کرد و قبوڵ بوو، وەهەڵبەتە موهیمیش ئەوەیە وتەو عیبارات و ڕواڵەتیش نیە، ئەو صەمیمی و صداقەتە ئەرزشی پەیا کرد، وەختێ کە ئەم وەحیە هات بۆ پێغەمبەر ( صلی الله علیه واله وسلم) لە حاڵی ڕکوع بوو هێشتا سەری بەرز نەکردبۆوە لە ڕکوع، ئەم خەبەرە کە پێی گەیی، ئەویش ئیعلانی کرد بۆ موسڵمانان " سمع الله لمن حمد"، خوا گوێچکەی دا بەوە، دەنگ لە

گوێی ئەژنەف وا شوکرانەی بەجێهێنا کە حەزرەتی ئەبوبەکر بوو کە ئەو مەنزەرەی دیت و وتی: "الحمد لله رب العالمين".

وەخێ حەزرەتی ڕەسوڵی خوا (صلى الله عليه واله وسلم) وەحی ئیعلان کرد، جەماعەت جۆش و خرۆشێکیان بۆ پێش هات بەمە کە حەزرەتی ئەبوبەکر حەمدێکی بەجێهینا، ئاوا زوو قابیلی  قبوڵ بوو بەلای خواوە، ئەوانیش بە شوینیا وتیان " ربنا ولك الحمد"، جا خوایە بۆ تۆ سوپاس، ئەو حەمدە وا ئەبوبەکر کردی ئەمانیش دوبارەیان کردەوە.

ئا ئەم خاڵە بچوکە لەبارەی شێوە و شێوازی نوێژ خوێندنی ئەوکات و مێژوی نوێژەوە، ئەوەمان نیشان ئەدا کە ئەو کۆمەڵە موسڵمانە چۆن بە ئەهمیەت و ئەرزشەوە نوێژیان ئەنجام داوە، بەڕاستی ئەوە کۆمەڵگای ئیسلامی بوو نە ئەو کۆمەڵگەی ئێمە! ڕۆژانە ئیعلان ئەکەین بە ئەنواع وەسائیل "أشهد أن لا إله إلا الله و أشهد أن محمد رسول الله" هەتا نە بەدەمی ئیعتیادی و بە قیڕە قیڕ ، بڵندگۆ بە دونیا بڵاوی ئەکەینەوە،  لە ڕادیۆ لە تەلەفزیۆن لە مزگەوتەوە لە منارەوە، بەڵاَم واقیعی زیندەگیمان چیە؟! کوا تەوحید؟ چ خەبەرێ لە تەوحیدێ ئیسلام و بەرنامەیی ئێمە، بەرنامەی ڕەفتاری ئێمە، تەوحید موقتەزای سادەی ئەمەیە کە (إياك نعبد و إياك نستعين)، لە دوو شتا موەحیدین لە عیبادەت و ئیستیعانە. بەندەگی یەعنی قبوڵ ئەمانە لە ناخی قەلبەوە، نەتەنها لەبەرامبەر خواوە،  ئیستیعانەت یەعنی مەدەد دوری لە پشت جیهانی بینراو و شەهادەوە ، مەدەد دوریەك لە جیهانی غەیب و مەربوت بە خواوە، جا ئێمە ئاواینە ئەگەر شەهادەت ئەدەین بە ڕیسالەی موحەممەد (صلى الله عليه واله وسلم)، ڕیسالەتەکەی بۆ چیە؟ بۆ ئەوەیە بەرنامەکەی

جێبەجێ بکرێت، خەبەرێ هەیە لەبەرنامەکەی موحەممەد (صلی الله علیه واله وسلم) ؟ هیــچ شتێ نیە !

بەتەنها ئەم زاهیر و ڕواڵەتەیە کە هیچ زەرەر و ئازارێکی بۆ کەس نیە، هیچ ئەرزشێکی مەنفی و فاسدێك لەبەین نابا، هیچ درۆزنێ لە ڕوو نابا، ئا ئەم ڕواڵەتە پوچ و بێ ئەساسمانە هەیە، ئەویش تەماشا بکەین لە چەندین سەدە لەمەوپێش، یەکێ لە موجتەهیدانی ئێمە، لە ڕەهبەرانی ئێمە (مالکی کوڕی ئەنەس)، ئەو کەسەی وا شایەتحاڵی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزی نوسیوە، ئەو عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەی وا لە دەزگای پڕ جەلالی ئەمەوی یا هەڵکەوت و خیلافەتی تازە کردەوە، هەرچی ئیمتیازات بوو وردی کرد و چووە سەر زیندەگی ڕەسولی خوا و خولەفای ڕاشیدین.

ئا ئەو ئیمام مالیکە لە زەمان خۆیا هاواری ئەکرد لەدەورانی ئەمەوی و عەباسی کە چیان کرد بە جیهانی ئیسلام، ئەمە عیبارەتی بوو "کە قەسەم بەخوا لە ئیسلام هیچێ نەماوە غەیری نوێژ نەبی ئەویشیان حەرام گەڕیاوە".

مالیکی کوڕی ئەنەس لەزەمانی عەباسیدا، لە سەرەتاکانی ئەم دەوڵەتەدا، ئا ئەو وەختە وا دەڵێ لە دین موحەممەد هیچ نەماوە غەیری نوێژێ نەبێ، ئەویشیان حەرام گەڕاندوە، خاسیەت و مەتواکەی نەماوە هەر ڕواڵەتی ماوە[1].

---

[1] سەبارەت بەم جۆرە تێڕوانینەی کاك ئەحمەدی موفتی زادە، لەسەرەتای ئەم کتێبەوە چەند سەرنجێکمان لەو بارەوە خستۆتە ڕوو. (ئامادەکار)

مالیکی کوڕی ئەنەس یەکێ لە ڕەهبەرانی چوار فیرقەی مەزهەبی سونی، یەکێ لە موجتەهیدانی گەورە، واقیعەن سادیقانە شوێنکەوتەی سوننەت بوو، ئەم وەختە وا دەڵێ و کۆمەڵگە بە موسڵمان نازانێ ، حەقی چیە؟ کۆمەڵگەکەی موسڵمانە، کەی شەهادەتی بە تەوحید و بە ڕیسالەتی موحەممەد سەحیح و موقابیل قبوڵە، وەختێ لە کردەوە و ڕەفتاریدا غەیری تەوحید هیچی تر نەبینێ، وەختێ لە کردار و ڕەفتاریدا بەرنامەی زیندەگی کۆمەڵایەتیدا یا هیچ شتێ موخالفی موقتەزای ڕیسالەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم)و هیچ شتێ موخالفی ئەو بەرنامە کە ئەو هێناویەتی نەبێ، ئەو تەماشای کرد نەوەڵا، کۆمەڵگەی هەواو هەوەسە، کۆمەڵگەی پلەو پایە و پۆست و مەقامە، کۆمەڵگەی ئەشرافیەت و ئیمتیازاتە، ڕەنگی کۆمەڵگەی موحەممەدی و ئیسلامی پێوە نەماوە موتڵەقەن ، ئێمە هێشتا لەو کۆمەڵگەی وا مالیکی کوڕی ئەنەس باسی ئەکرد کە دوورە لە ڕێگەی ئیسلام، زیاتر دوورین لە ڕێگەی ئیسلام، ئەگەر جار جارێ بەو جۆرە گۆشە گەلێ لە ڕاستی مێژوی ئەو کاتە، لە ڕەنگی کۆمەڵگەی ئەو کاتە نیشانمان بدرێ و بیخوێنینەوە، ئیحتیمالی هەیە میقدارێ کەم لەو ئیحساس و دەرکی شعورب ئیسلام بۆ ئێمە پەیدا ببێت.

ئا ئەم ماجەرا بچوکە گەڕاندمەوە، لەو نوێژەو لە حزور حەزرەتی ئەبوبەکر و لەو ئیجتیماع و ئەو کەلیمەتەی کە حەزرەتی ئەبوبەکر وتی و ئەو قبولە لە تەرەف خواوە و ئەو وەڵامە وا موسڵمانان دایانەوە، میقدارێ فرە وەزعی ئەو کۆمەڵگەو وەزعی نوێژ کردن و عیبادەت کردنی ناو ئەو کۆمەڵگە بۆ ڕۆشن ئەکاتەوە، جا ئازیزان فیکری لێ بکەنەوە،

ئەگەر موسڵمان ئاوا بێت و نوێژ ئاوا بێت، چەنێك درێغ و حەیفە دوور بون لە کۆمەڵگە بەو جۆرە، لە ئیجتیماعیٚ ئاوا، زیاد لەوە کە حەیفە، ئایا ئەگەر ئیجتیماعی ئاوا پاك و موتەحەریك و فەعال بۆ ململانیٚ لەتەك ئەنواع فەسادا، ئیجتیماعێکی هەبیٚ لە بەین ئەو هەموو نارِەحەتی و ئاژاوەدا، لەناو ئەو گشتە خەتەراتە وا هەن، برِۆن جەم بن لە جێگەیا بەو جۆرە ئینسان بتوانیٚ بیٚ دەردی سەر برِواتە ئەو ئیجتیماعە و نوێژ بکا، ئایا ئەوە ئەرزشی ئینسانی هەیە؟ لایەنی دینی ناڵێم، کۆمەڵگەیەك هاتۆتە ئەو گشتە فەسادیە وا بەشەریەت گرفتایە، ئەو گشتە ئیمتیازات و جەور و ستەمە وا بەشەریەت گرفتاریە لە بەین ئەبا و نایهێڵێت،، ئەم کۆمەڵگە خەریکە جیهاد ئەکا و موبارەزە ئەکا بە گیان و بە ماڵ و بە هەرچی شت گەلی وا لە ئەرزشیٚ زیندەگی خۆیا هەیە، بەمە خەریکە جیهاد ئەکا بۆ ئەوەی بەشەریەت لە ئەنواع زوڵم و فەساد رِزگار بکات، ئەم کۆمەڵگە ئەتوانیٚ؟! هەڵبەتە کۆمەڵگەییٚ ئا لەو حاڵەتی زەعیفیا بێت کە ئاوانین و ئەوەنەنین پێی بڵێین کۆمەڵگە وەك ئەوەی وا ئیشارەتم پیٚ کرد، تەنها ئەتوانیٚ فرسەت گەلیٚ بدۆزیتەوە، جار جاریٚ لەفرسەتدا جەمۆ بن بۆ بەرنامەی پەروەرشی خۆیان، بەرنامەی تەقویەی خۆیان، نیەتی خۆیان لە رِێگەی فیداکاری و جیهادەوە ئیجرا بکەن، ئەگەر ئینسانێك بیٚ ئەوە کە فشارێك بیٚ، تەبیعەتەن ئارەزوو ئەکا برِواتە ناو ئەو ئیجتیماعەوە با پەیوەندیشی نەبیٚ بەو ئیجتیماعەوە!

بۆ هەر ئیجتیماعیٚ لە دنیای ئەمرِۆشدا وێنای بکەی کە جەماعەتیٚ ئینسان کۆئەبنەوە لەشوێنێکدا، بۆ یەك کاری کاریگەری سوود بەخش بۆ

بەشەریەت، ناڵێم بۆ تەواوی لایەنەکانی بەشەریەت، یەك بەرنامەی زانستی بچکۆلە، کە شیکاری زانستی بکەن و کەشفی زانستی بکەن، ئەگەر کەسێ خۆی بدزێتەوە لەو ئیجتیماعە خوێن تاڵ نیە لە ڕوانگەی ئێمەوە؟! چ جای ئیجتیماعێ کە ئەیەوێت هەرچی فەسادە ڕیشەی دەربێنێ لە ئەساسەوە و کۆمەڵگە ژێرە و بان بکات و داغان بکات و یەك کۆمەڵگەی ئینسانی تیا دروست بکاتەوە، چەنێك ئەم مەتڵەبە ئەرزشی هەیە نیسبەت بەو مەتڵەبە عیلمیە کە وتمان، ئەونەش خۆدزینەوە لە ئیجتیماعی بەو جۆرە مەنفور و خوێن تاڵ ترە نیسبەت بە خۆ دزینەوە لەم ئیجتیماعە عیلمیە.

یەك ڕونکردنەوەی سادە بۆ دەرخستنی گرنگی ئیجتیماعی ئەمڕۆی ئێمە لەبارەی نوێژی جەماعەتەوە ئەڵێم:

لە سەرەتاکانی ئیسلامدا جەماعەتێ بوون کە وەختێك لە شاری مەدینە زۆرینە ڕویان لە ئیسلام هێنابوو، ئەوان پەیمانی ئیمتیازاتی گەورە گەورەیان پێ درا بوو بە بۆنەی ئیسلامەوە لەدەستیان دەرچوو کە ئەویش داستانی تولانی هەیە، وە ئەو جەماعەتە ناچاربون لەبەر فشاری تائیفەکەیان بەڕوکەش خۆیان بە موسڵمان نیشان بدەن، ئەشراف بوون وچاوەڕێی ئەشرافیەتی گەورەتریان ئەکرد لە دەستیان دەرچوو، بەڵام تەماشایان ئەکرد، وەختێ جەماعەتی میللەت دوو قەبیلە بوون، قەبیلەی ئەوس و خەزرەج، ئەفرادی قەبیلەکەی خۆیان هاتون موسڵمانە ئەبن، ناچار ئەبون ئەوانیش بە ڕوکەش ببنە موسڵمان، بەڵام موسڵمانی و بەڕوکەش موسڵمانی زۆر جیاوازیان هەیە، چونکە بەڕوکەش مسوڵمانی بون، نەیئەتوانی ئا ئەو جۆرە کە ئیسلام مافی تەواوی چینەکانی کۆمەڵگە

به یەکسانی ئەدا تێبگات و ئەنجامی بدات. یان نەیئەتوانی بەو جۆرە ڕەفتار بکات، وەختێ ئەهاتە مزگەوت تەماشای ئەکرد مەسەلەن کارگەرێکی سادە دانیشتوە، ئەمیش بەهەمان شێوەی بەرنامەی ئیسلام دابنیشێ، وەختێ سوجدە ئەبا سەری موبارەك و بە عەزەمەتی کە واقعیەت ئەمەیە، دوێنێکە بە تەما بوو تاجی بخرێتە سەر و ئامادەی کردبوو بۆ تاج لەسەرنان، بەلاّم موحەممەد(صلی الله علیه واله وسلم) هات و تەفرەیدا، بۆ هەمیشە کردیە داخ لە دڵیانا، ئا ئەو سەرە کە دوێنێکە ئینتیزار تاجی بوو، ئەمڕۆ ئێ ئێ دانیشێ لە ژێر قاچی کابرا ، لەژێر ئەو چڵك و کەسافەتا کە کارگەر بەیانی تا ئێوارە جەمئەبێتەوە لەژێر قاچیا، نەیئەتوانی تەحەمول ئەمە بکا ، چیان کرد؟! چون مزگەوتێکی تریان دروست کرد، نەیان ئەتوانی و جورئەتی ئەوەشیان نەبوو کە ڕاشکاوانە ئیعلانی موخالەفەتی ئیسلام بکەن، هەربۆیە مەشهور بوون بە موناقفین (دووڕوەکان)، لەحەقیقەتا ئەهلی کوفر بوون، ئەهلی ئەو شیرك و بتپەرستیە و ئیمتیازاتە بون، بەلاّم بەناو موسڵمان بوون، ئەگەر وابێ چی بکەن؟! بەڵێ ئێمە موسڵمانین و ئەهلی عیبادەتین، بەلاّم فەرقمان هەیە لەتەك خەڵکا، با بڕۆین مزگەوتێ تر دروست بکەین، بەڵێ مزگەوتی پڕ زەوق و بڕق، پڕ پلەو مەقام، نەوەك مزگەوتی موسڵمانەکان چوار دیوارێ بوو، مزگەوتی ئەوان پڕ لە ئەشرافیەت و زەوق و بڕق بوو، جێگە دیاریکراو بوو، ئەوە جێگەی حەزرەتێ ئاغا فڵان، ئەوە جێگەی جەناب فڵان، بەلاّم نوێژێك بەدڵ نەبێ، هیچ کاریگەریەکی نابێ، نوێژی ڕواڵەتی چ سودێکی هەیە، بەلاّم لای ئەوان ئەوە مەقبوڵە، چونکە ئەو

ڕەنگە وا مەتلۆبی خۆیانە و ئەو نەوعە زیندەگیە وا مەتلۆبی خۆیانە هەر ماوە، ئەشرافیەت و جێگە بە جێگەی دیاریکراو، ئەمە مزگەوتێ بوو لە بەرامبەر مزگەوتی ئیسلامەوە، خوای گەورە پۆلێنی ئەم دوو کۆمەڵە ئەکات لە بەرامبەر یەکەوە ، بۆ ئەبەد ئەمانە نمونە و سەرمەشقن بۆ مزگەوت گەلێ کە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیا دروست ئەبێ کە ئێمە بتوانین لە ڕووی ئەو تایبەتمەندێتیەوە بیان ناسین، مزگەوتی موسڵمانەکان ناو ئەنێتە مزگەوتی (تەقوا)، مزگەوتی مونافقین ناو ئەنێتە مزگەوتی (ضرار)، نیشانەکانی مزگەوتی زرار ئەمە بوو کە جێگەکان دابەشکراو بوو، نازانم ئێستە ئەگەر شتێ بێ کە من خەبەرم لێی نەبێ، ئەوە وا من شارەزام، مزگەوتەکانی ئەم شارە گشتی مزگەوتی زرارە و مزگەوتی مونافقینە، جا دێن تەئویلی ئەکەن، کێ ؟! عەوام گەلی موتەقەلیب گەل، ئا ئەوانە وا خوای گەورە هەرەشەیان لێ ئەکا بە ناو زانای دینی هەمیشە ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَٰئِكَ لَا خَلَاقَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ[1]﴾ دینی خوا و حەقایق ئەگۆڕن بۆ مەردم بۆ ئەمە پارچە نانێ بخەنە بەریان، بە زەهرێ ماریان بێ. جا ئا ئەمانە تەئویلی ئەمە ئەکەن بەوەی ئەها لە ئیجتیماعا وەختێ مسوڵمانان جەمۆ ئەبون هەمیشە مەسەلەن (عەممار، بیلال، عومەر، ئەبوبەکر، عەلی، تەڵحە)، ئا ئەم جۆرە ئینسانانە لە سەفی ئەوەڵەوە بون، ئێژن نا، جا کەلیمەکەی چۆن دروست ئەکەن کەلیمەی ئەشراف بەچی؟ بە تەڵەك و تەزویر!

---

[1] سورەتی (آل عمران/ ٧٧).

ئەشراف دوو ماناى هەيە:

يەك: ماناى ئينسانى، ئەو مرۆڤانەى كە لە لايەنى ئەرزشگەلى ئينسانيەوە، بانترن لە مرۆڤەكانى تر...

دووەم: ئەشرافى پەيوەست بەو عورف و ئيمتيازات و چينايەتيەى كەوا هەميشە لە مێژوى بەشەريەتدا هەبووە و بەشەريەت زەجرى كێشاوە لە بەرامبەريەوە، ئێستا هەمان ئەو وشەى ئەشرافە بەكاردێنن بۆ ئەمان و ئەڵێن ئەوانە ئەشرافن، ئەشراف ئەبێ لە پێشەوە بن، ئاخر بێ شعورى هيچ نەديو، مزگەوتى زرار عەيبى تەنها ئەشرافيەت بوو، ئەو ئەشرافيەتە دونياييە كە بۆ پلە و ئيمتيازاتە. ئەمان دەيهێنن دوبارە هەر ئەو كەليمەى ئەشرافيەتە بەكار ئەبەن، بۆ ئەو مرۆڤانەى كەوا هەرچيان كردبوو لەڕێى خوا و ئيسلامدا بەخشيان، لەوانەش ئەبوبەكرى صديق كە زوتر واقعى ئەشراف بوو لەدەورانى جاهليەتدا، ئەهلى ئيمتيازات و پلەو پايە، بەلاّم هەرچى سامان و ماڵى بوو فيداى كرد لەڕێى ئيسلامدا، لەكاتێكدا خۆى شتى نەبو بيبا بيفرۆشێ بۆ ئيسلام، ئەچوو كاسەو كەوچك و دەسماڵى خەڵكى هەڵئەگرت لە بازار ئەيفرۆشت، حەماڵى ئەكرد و حەقى كارەكەى وەرئەگرت، چونكە خۆى هيچى پێ نەمابوو.

وشەى ئەشراف بەرهەمى دەورانى جاهليەت بوو، ئێستا ئەيهێنن تازەى ئەكەنەوە بۆئەم دەورانە، هەڵبەتە ئەگەر لەڕووە ئينسانيەكەوە بێت بەماناى بەشەرەفن دروستە و هەڵەيەكى نيە، بەلاّم ئەيهێنن و بەهەڵە سود لەمە وەرئەگرن هەر كەليمە خراپەكەى جارانە و زيندوى ئەكەنەوە و پێى ئەڵێن ئەشراف، پاشانيش مەگەر ئەمەى كەئەوترێ ئەو هاوەلاّنەى

وا ناوم هێنان لەڕیزی یەکەمدا بون هەندێ جار ئەویش نەك هەمیشە، لەبەرچی بوو؟! لەبەر ئەوەی جێگەیان دیاریکراو بێت و خاڵی بێت تا ئەمان بێن داخڵ ببن وەك مزگەوتی زرار؟! نا، لەبەرئەوە بوو لە یەکەمین موجاهیدینی ڕێی ئیسلام بون، لە یەکەمین جوڵەی ئیسلامی، لە یەکەمین فەعالیەتی ئیسلامدا حازر بون هەمیشە، هۆکارەکەی ئەوەبوو، ئەگەر نا  کاتی واش هەبوە کە هەر لەم کەسانە پێش هاتووە لە ئاخیری ڕیزەوە جێ خاڵی بووە دانیشتون، ئەیانەوێ بەم جۆرە خەڵك گێژ بکەن، بەڵام هەرئەشرافن و ئەشراف، بە مانا ئیمتیازاتەکەی سەیر ئەکەی لە ڕاستیدا بەم مانا مادیە زۆر ناپەسەندە و ژیانی مرۆڤی پیس کردوە لە خراپترین ئاژەڵیش خراپترە.

من پەیوەستم بە موسڵمانێتیمەوە و حەز ئەکەم لە هەموو لایەکەوە موسڵمان بم، لەزەت ئەبەم  لە نوێژی جەماعەت حازر بم، بەڵام نوێژێك نەچوم، جەماعەتێ نەچوم مزگەوتێ نەچوم،  ڕەنگ مزگەوتی زراری پێوە نەبێ و ڕەنگی مزگەوتی ئیسلامی پێوە بێ، ڕەنگی مزگەوتی تەقوای پێوە بێ، ئەوەی لە کۆمەلگای ئێمەدا هەیە ئەمەیە ئەمە لەلایەك، لاکەی تری بەینێ لەمەو بەر کەسێك تەلەفونی کردو خۆیشی نەناساند: وتی ئەوەتاین لە مەجلیسێکدا باسێك لە بارەی جومعەوە بوو، ڕەخنەیان لە تۆ گرت کە ناچیتە جومعە! وەڵام زۆرە بۆ ئەم پرسیارە، یەك وشەی سادە ئەڵێم ئینسانی زانا بەرپرسیارێتی زیاترە لە ئینسانی نەزان لە هەمو شتیکدا نەك هەر لە دینا لە شتی بچوك بچوکیشا ئەگەر تۆ لە بازاڕدا ببینیت یەك نەفەر ناونیشانی دەوێت و نەفەرێکی تر بە هەڵە ناونیشانی پێئەدا و ڕێنمایی ئەکات، ئەگەر ئەو ناونیشان پرسینە سیاسی نەبوو،

خزم و کەسی بوو، فێڵی تیا نەبوو، حەقی تەبیعی مرۆڤێك بوو، یا لەوە گرنگتر کێشەیەکی هەبوو بڕوات حەلی بکات، یا کێشەیەك بۆ کەسێك حەل بکات، دێت پرسیار ئەکا و تۆ لە بازاڕی ئەبیستیت و ئەبینی بە هەڵە ناونیشانی پێئەدەن و ئەڕوا سەرگەردان ئەسوڕێتەوە، وا بزانە تۆی ئەوەی ناونیشانەکە ئەزانی  و ئەزانی لە کوێیە حەقی تەبیعی خۆیەتی بڕوا بۆ ماڵ ئەو کابرا، وە تۆ بێدەنگ ئەبی و ئاگاشت لێیە ناونیشانی هەڵەیان پێداوە، لەو کاتە تۆ تاوانبار و گوناهباری، جا لەسەر ئەساسی ئەم نمونە سادە وا وتم بۆ ئەوەی زۆر درێژی نەکەمەوە، من وا ئەزانم ئەو مەجلیسانەی وا لە مزگەوتدا ئەگیرێن بەناوی نوێژی جەماعەتەوە، وەکو هەمان مزگەوتی زرارە، چونکە ئەبینم ئاشکرا ئاشکرا درۆ ئەکرێ بەدەم خوا و پێغەمبەرەوە (صلی الله علیە والە وسلم)، ئاشکرا ئاشکرا ئەبینم مەبانی و مەعاریفی دین ئەگۆڕدرێ و تەحریف بۆ خەڵك ئەکرێ، ئەگەر بڕۆم و بێ دەنگ بم مەسولیەتە لەسەرم و شەریکی تاوانم.

کتێبێك هەیە بەناوی (اصول فقه) کە زانستێکی موهیمە، هەر کەسێك ئەهلی درك و ئیستنبات بێت، یا قازی یا وەکیل، بەدڵنیاییەوە ئەگەر بێت و شارەزای ئسوڵ فیقه بێت  و لێی بزانێ، زانیاری زۆر دەبێ دەربارەی دین، بەپێی ئەو ئسوڵە بێ دەنگی مرۆڤی زانا (حجت المدرکە).

مەسەلەن من ئەڕۆمە مزگەوتێ، ئەبینم ئەو هەموو دین فرۆشیە و دونیا کڕینە ئەوترێ و باس ئەکرێ، بێ دەنگ بم، شەریکی تاوانم، کافر نیم، دوژمنم لەگەڵ دینی خوا، نەك کافری عادی بەمانای ئەوەی لەم وڵاتە هەیە، نا کافر بەمانای قران، یانی ئەزانم درۆ ئەکرێ بە زمان خواو

پێغەمبەرەوە (صلی الله علیە والە وسلم) وە بێدەنگ ئەبم و قبوڵی ئەکەم، یانی خەریکم شەڕ ئەکەم لەگەڵ دینی خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسلم) یانی بە ئەنقەست و بەئاگایی قبوڵی ئەکەم کە شەڕ و پیسی و نەجاسەت بدرێتە پاڵی و هەموو کارێك بدرێتە دەست ئەهوا و ئارەزوی خەڵکی، بەجێی بەجێهێنانی دینی خوا و پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسلم).

لەساڵانی (١٣٣١-١٣٣٤) دەقیق بیرم نایەت چ ساڵێکیان بوو، بەرنامەیەکم دروست کردبوو بە ئیحساس و ئەزمونی منداڵانەی خۆم، وە بە کەم عەقڵی خۆم و بەبیری منداڵانەمەوە، ناڵێم ئێستا کامڵم، لە ئێستا ناقص تر بوم، بەرنامەیەکم تەرتیب کردبوو لە مزگەوت، جارێکیان باسێکم ئەکرد، لە یەکێ لە باسەکانمدا، ڕونکردنەوەمدا لەسەر ڕیزبەندی و پێم وتن، ڕیزبەندی لە ئیسلامدا نیە، ئەبێ ڕیزی یەکەم تەواو بێت و پڕ ببێتەوە، ئینجا ڕیزی دووەم دروست بکرێ، هەر بەو جۆرە تۆزێ باسم کرد و وتم ئێوە شەریکی تاوانن کە ئەم ئەشرافیەت و ئاغا و عولەمایانەتان هێناوە و ئیمتیازاتان پێداوە و مزگەوتی زیراریان دروستکردووە بەناو مزگەوتی تەقوا، ئێوە وەرن هیچ نەبێ لەژێر گوناه خۆتان بێننە دەرێ و شان بەشانی یەکتر ڕابوەستن و ڕیزەکان تەواو بکەن و تا ڕیزێ تەواو نەبێ ڕیزێکی تر دروست مەکەن، جەماعەت هاتن و ڕیزیان دروست کرد، ڕیزی پاکوخاوێن و دوور لە چینایەتی و ڕیزبەندی، بەلاّم تەنها سێ هەفتە توانیم بچم و ئیتر نەمتوانی بچم و کۆتایی پێهات...

ئەمە ئەزمونێکە بیری لێبکەنەوە، ئەکرێ کەلیمە کەلیمەو هەنگاو هەنگاو هەرچی بڵێن بڵێم ئەوە هەڵەیە و ئەمە هەڵەیە، بەلاّم قسە گرنگی

نامێنیٚ، خەڵك ئیتر نابیستن، تەحەمولی ناكەن و قبوڵی ناكەن لەكۆمەڵگادا، هەندیٚ جار ڕۆشتن بۆ ئەو جەماعەتانە كوفرە و شەڕە لەگەڵ دینی خوا، هەندیٚ لەڕوی سادەییەوە تەماشای ئەكەن و ئەڵێن بابە ئەمە شیعاری ئیسلامە و با هەڵگیرسیٚ، بابە ئەمە ئیسلامی نیە و ئەشرافیە، نوێژەكەی هەر مزگەوت زیرارە لەناوچیٚ، من بێنم ئەشرافیەتی موناففقین لە مزگەتی خۆما جێبەجیٚ بكەم و ناوی بنێم دروشمی ئیسلامی، یانی ئاوا حەیای دین ببەم! یانی بڵێم موحەممەد (صلى الله عليه واله وسلم) ئەمەی هێناوە! ئگەر موحەممەد (صلى الله عليه واله وسلم) ئەمەی هێنابیٚ، هیچ كات بە عومرم پەیڕەویم لیٚ نەئەكرد، من ئەونە خیانەت بكەم لەم كۆمەڵگایە مزگەوتی زرار بە مزگەوتی تەقوا بە خەڵك بناسێنم! چیە! خۆ شیعاری ئیسلامیە با هەڵگیرسیٚ! ئاخر شیعاری ئیسلامی نیە، شیعاری موناففقینە، شیعاری نیفاقە، شیعاری زرارە! نیەت جیاوازە، ئینسان هەیە ناچێتە مزگەوت و نوێژەكەی بە جەماعەت بكات، گوناهی ئەگات، بۆچی؟! لەبەر ئەوەی هیچ هۆیەك نیە، هیچ نازانیٚ لەبارەی دین، تەنها لەبەر تەمەڵی و بیٚ موبالاتیە، بیٚ شك ئەمە تاوانبارە، كاتیٚ ئەڵیٚ من موسڵمانم، یانی بەتەواوی بەرنامە و ئەركەكانی ئیسلام پەیوەستی و پابەندیم هەیە، كاتیٚ بەرنامەیەك لە ئارادایە و ناتوانیٚ ئیرادێكی هەبیٚ، هیچ عەیبێك شك نابا لە خۆیدا و بەڕاستی گوێی پیٚ نادات، حەتمەن گوناهبار و تاوانبارە، خۆ ئەگەر نەخۆش بێت و ئەزیەت و ئازارێكی هەبیٚ، یان ئەگەر بچێت

دەردی سەریەکی بۆ دروست ببێت، ئەوە ئەگەر نەچێت قەینا کێشە نیە...

## مەلەئو موترەفین و موستەزعەفین

ئەم سێ وشە لە قورئاندا زۆرجار ئەبینین، مەلەئو موترەفین لەبەرامبەر موستەزعەفینەوە، لە قورئاندا بۆمان ئەگێڕێتەوە، لەهەر کاتێکدا پێغەمبەرێك، موسڵیحێکی دینی هاتبێ بۆ ناو جەماعەتێ بۆ هیدایەتدان، مەلەئو موترەفین دەستیان کردۆتە شەڕ لەگەڵیان و بە زۆر شت ویستویانە لە ناوی بەرن و بێدەنگی بکەن، قورئان وا باسیان ئەکا بۆ ئێمە، مێژوی ژیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) و مێژوی ژیانی ڕیسالەت مێژوی شەڕە لەگەڵ مەلەئو موترەفین، زۆرینەی کۆمەڵگا و بەشێکی زۆری خەڵك، خودا ناویان بە موستەزعەفین دەبات، جەماعەتێك کەخودای گەورە هەندێ جار بە مەلەئو هەندێ جار بە موترەفین.

مەلەء بە ئەسڵی بونیان و موترەفین بە جۆری ژیانی ئابوریان ناو ئەبرێن، هەندێ جاریش بەجۆرێکی تر ناو ئەبرێن و باس ئەکرێن، بەڵام ناوە بڵاوبووەکەیان مەلەئو موترەفینە، ئەمانە کۆمەڵەیەکن کە هەمیشە لە هەر زەمانێکدا لەناو کۆمەڵگادا تایبەتمەندێتی بەخۆیان ئەدەن و بەمەش ئەشرافیەت و گەورەیی و دەسەڵات و هێز و قودرەت و ماڵ و سامان بۆ خۆیان دەستەبەر ئەکەن، گوێی خەڵکی پڕ ئەکەن لە ترس و هەیبەت، مانای ڕاستەقینەی مەلەئیش هەر ئەمەیە کە دەسەڵات و هێز و قودرەت و ماڵ و سامانیان ئەوەندە زۆرە کە چاو هەرچی کەسە پڕ

ئەکات، خەڵکی لە بەرامبەریانەوە توانای قسەکردنیان نامێنێ، ترسیان ئەوەندە بەجۆرێکە خەڵك لە قسە کردن ئەخات لەبەرامبەریانەوە. خەڵك ڕێزیان لێ ئەگرێ لەبەر ترسیان، یانی ئەگەر ڕێزیان نەگرن زەرەرێکیان پێ ئەگەیەنن،پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم) لەباسی ئەوانەدا فەرمویەتی، خراپترین و پیسترین ئینسان ئەوەیە کە خەڵکی تر لە زیانی بترسن، ترسیان لێی هەبێ کە توشی شتێکیان بکات، ئائەوانە مەلەئو موترەفینن، ئەوانەن خەڵك ئیتر دەسەلاَتیان نامێنێ و توانای قسەکردنیان نامێنێ لەبەرامبەریانەوە و وزەیان دەرنایێ، ئەمانە پێیان ئەوترێ موترەفین لەلایەنی ئابوریەوە، ئەوانەی وا نوقم بون لە نازو نیعمەتدا و خۆشگوزەرانن، ئەگەر ماڵ و سامانی گشتی سەیر بکەین، بەشێکی زۆری هی ئەوانە، ئەوانن سودی لێ ئەکەن، ئەمەش یەکسانە بە لاوازی خەڵکی، نەك هەر موڵك و سامان بەڵکو لەلایەنی مەعنەویشەوە ڕێزی لێ ئەگیرێ و پلەی کۆمەلاَیەتی بەرزی هەیە کە زۆرینەی خەڵك بێ بەشن، بێ بەشی خەڵکیش یەکسانە بە زیادە مەسرەفی ئەوان لە خۆشگوزەرانیدا، ئەوان ئەم کۆمەڵەی کەلەبەرانبەر ئەوانەوە وەستاون، قورئان ناویان بە موستەزعەف ئەبات. لەدوایی ئەوەی کە قورئان لەچواردە سەدە لەمەو بەرەوە کۆمەڵگای بەو جۆرە هێناوە، دوو گروپی بەرانبەر یەك داناوە، گروپی مەترسیدارو شەڕو زەرەر بۆ گۆمەلگا، لەبەرانبەردا گروپی زوڵم لێکراو و تەحەمولی فشارو دەردو ڕەنج.

سەیر ئەکەی کۆمەلگای ئێمە تەنانەت ناو ئەمانەی نەبیستووە و نایزانێ، ئەو وشانە کە مێژوی ژیانی پێغەمبەرانی پڕ کردووە، بەوجۆرە کە

قورئان به ئێمەی حاڵی کردووە، له هیچ وڵاتێکدا و له هیچ کۆمەڵێکدا پێغەمبەرێك نەهات مەگەر ئەمەی مەلەئو موترەفین دەستیان کردبێ به شەڕ لەگەڵیان، هەمیشه له مێژووی ژیانی بەشەردا پێغەمبەران هاتوون مەلەء شەڕیان کردوە لەگەڵیان، نەك تەنها لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه واله وسلم)، هەر بیربکەنەوە به ئیعتباری ژیانی ئابوری و کۆمەلأیەتی ئێمه ئەم دوو کەلیمەی مەلەئو موترەفینه لەبەرانبەر موستەزعەفینەوە ناسینی چەنێك گرنگ و زەروریه، خۆمان به کۆمەڵگای ئیسلامی ناوئەبەین لەحاڵێکدا هیچ ئاگاییەکمان لەم وشانه نیه، ناوە کانیمان نەبیستوە، ئەتوانم بڵێم ئێوەی گەنج و خوێنەواری ئەم وڵاته له سەد نەفەرتانا دوو نەفەرتان هەر نەیبیستبێ تا بگات به ماناکەی کێ وای کرد؟ بەچکه موترەفین، بەچکه مەلەئو موزەورین وایان کرد ئەم وشانه ون بن، خەڵکیان به تەواوی لەقورئان بێگانه کردووە، هەتا ئەم وشانه که ئەلفوبێی ژیانی ئیسلامیه، تەواوی هەموو مێژوو بریتیه له شەڕی پێغەمبەران بۆ ڕزگاری موستەزعەفین و پێداگری مەلەئو موترەفین له بەرامبەریانەوە، ئەم دوو وشه گەورەیه که تەواو مێژوی ئێمەی پرکردووە، ئێمه واته ئەوانەی وا ئەهلی دینین له ئادەمەوە تا موحەممەد(صلی الله علیه واله وسلم) سەیر ئەکەین خەبەرمان لێی نیەو نەمان بیستوە و ماناکەی نازانین، خۆشمان به پەیڕەوی موحەممەد(صلی الله علیه واله وسلم) دائەنێین و دەڵێین (اشهد ان لا اله الاالله واشهد ان محمدا رسول الله) ئیستاش دوباره زۆرینەی خەڵك داماو و فەقیرو موستەزعەفه، به دور لەمانه ڕووی ئەو مەلەئه ڕەش وا وشەی مەلەئو

موترەفینیان بە ئێمە حالّی نەکردو موستەزعەفیان بە ئێمە نەناساند، ئەوە بۆ پێمانی نالّێن لەبەر خۆیان پیشەوا دینیەکان ساخت و پاخت ئەکەن بەچکەیەکن لە مەلەئو موترەفین، بۆخاتری ئەوەی ژیانی خۆیان خۆش بگوزەرێ، ئێمە بەتەواوی لە قورئان بێگانە ئەکەنەوە و ئەو وشە ئەساسیانە کەوا ئەسلّی مێژوی دینە و ئەساسی جولّەی کودەتای دینیە لەناو جەرگەی مێژوودا لە ئادەمەوە تا موحەممەد(صلی الله علیە والە وسلم) ئەم وشانە لە ئێمە دور ئەکەنەوە تا نەیزانین. بەکورتی مەلەئو موترەفین دەستەی زالّم و هەیبەت و دەسەلاّت و مالّ و سامانن، موستەزعەفین بریتین لە خەلّك لە میللەت، دین بریتیە لە ڕزگاری موستەزعەفین لە بەرامبەریانەوە زاناکان هاتون لە بیر خۆیانەوە چەند وشەیکیان دروست کردوە کە حالّی موستەزعەف نیشان بدەن، مەسەلەن ئەلّێن ڕەنجبەر، زەحمەتکێشان، ئەم جۆرە وشانە لەبەرامبەر ڕاستی نیشاندانی ژیانی موستەزعەفینەوە قەترە بە دەریاش نیە...

ژیانی موستەزعەف، هەزارجار دەردو ڕەنج و میحنەت و تەحقیری تیایە، قورئان کاتێ وشەی موستەزعەف داناوە کە تەواوی زولّم و ستەم کە میللەت ئەیچێژێ بەدەست مەلەئو موترەفین لەمادی و مەعنەوی و سیاسی و کۆمەلاّیەتی و ئابوری هەموی ئەگرێتەوە، سادەترین شت خۆ ڕەنگە ئەمە ڕەنجبەرێکی تیا نەبێ، کابرایك بەیانی تا ئێوارە ئەڕوا بۆنمونە لە دائیرەیەك دادەنیشێ، سەیر ئەکەین زۆر سادە ئەیبینین جەنابی لە پشت مێزێکەوە دانیشتوەو هەزار جنێو ئەدا کەس نالّێ عەیبە، کەس نالّێ کارێکی خراپەو بێ ئەدەبیە، ئەگەر فەقیرە چاو بەرز

بکاتەوەو بڵێ بۆچی جنێو ئەدەی بە قوربانی سمێڵە ڕەشەکەت بم؟! ئەڵێ سەیر بکەن چەند بێ ئەدەب، چەند بێ شەرم و ڕوو، چەند بێ حەیا!

هەرچی خەڵکی مەزلۆمی کۆمەلگایە، تەواو خەڵکێك کە لە بەرامبەر مەلەئو موترەفین وەستاون موستەزعەفن، بەلاّم وشەیەکی تر شایەنی ئەوە نیە کە پێیان بوترێ جگە لە موستەزعەف، بەڕاستی بۆ ئەوەی حالّیت بێ کە ئینسان چ زەجرێ ئەکێشێ لەبەرامبەر مەلەئو موترەفینەوە، دوو گروپ نین، یەگ گروپن، ناوی ئەسلّیان لە قورئان مەلەئو سیفەتی ئابوریشیان موترەفینە، زەجرێك کە خەڵك ئەیکێشێ لە بەرامبەریانەوە بە هیچ شتێك باس ناکرێ، جگە لە موستەزعەفین (زەعیف کراو).

بە درێژایی سەدە جیاوازەکان، جەماعەتی مەلەء بیرورای خۆیان سەپاندووە بە مل کۆمەڵگادا و فەرهەنگێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، نەیان هێشتووە بیروڕای ئینسانی کە پێغەمبەران هێناویانە زۆر بەجوانی جێبەجێ بکرێ و جێگا بگرێ، ئەرکی موستەزعەفین و دڵسۆزی موستەزعەفینە کە هەوڵ بدەن ئەوانە بە هەرچی شتیان هەیە لەناوی بەرن، ئەم وشانە من هەمیشە باسیان ئەکەم سەیر ئەکەی لەناو کۆمەڵگایەکدا لەڕوی زەوی، نەك کۆمەلگا ملیۆنەها و هەزاران زەجری برسیەتی ئەکێشن، فلاّنە کەس دائەنیشێ لەسەر سفرە، ئەویش نەك لەماڵ خۆی، لەماڵی خەڵکدا سەر دائەنەوێنێ و پاشاخورێك ئەخوات، لەناو دەوریەکدا زۆری هێشتۆتەوە کە بە ڕاستی بەشی مرۆڤێك ماوە کە بە تەواوی تێری بکات، ئەمە ژیان خەڵك وایە؟! نە ئەسلّەن ئینسانی نیە!

ئەمە ئەشرافیە و ئەتواری ئەوانە بۆ ئەوەی بڵێن ماشەڵڵا چەند بەرچاو تێرە، با خزمەتکار و نۆکەرەکە بیخوات، خەڵکی مەیمون سیفەتیش بەداخەوە موستەزعەفین، کاتێ داماو ئەبن کە تێگەیشتنیان نامێنێ، کە خەیر و شەڕ لەیەکتری جیا ناکەنەوە، کەلاسایی فەرهەنگێکی نا ئینسانی ئەکەن.خەڵکی موستەزعەفینیش ئەوانەی وا هەرچی ئەم فەرهەنگە هەیە بە زەرەر ئەوانە، هەر دێن لاسایی ئەکەنەوە، سەیر ئەکەی جەماعەتێ لەم خەڵکە عادیە کۆئەبنەوە لە مەجلسێکدا خۆراك دانراوە سەیر ئەکەی١٠-١٢ دەوری خواردن ماوەتەوە پیس کراوە بێ ئەوەی بیخۆن، ئەمە هەمان هەڵسوکەوتی ئەوانە کە ئێمە ئەنجامی ئەدەین، خستویانەتە سەر زمانی ئێمەو زۆربەشی لە ڕەفتارو کردار و ئەخلاق و ئادابماندا ڕەنگی داوەتەوە، شەرت نیە بە زمان بوترێ، بەلاّم لەناو ژیانی ئێمەدا پربوون کە لە ڕاستیا فەرهەنگی ئەشرافیە...

# مەزهەب چیە؟ جیاوازی نێوان مەزهەب و دین چیە؟

مەزهەب و دین بەكورتی و بە پوختی بلێین وەك لقە لەگەل تەنی دارا، دین یانی ئەسڵی بەرنامە بە تەواوی تایبەتمەندیەكانیەوە، وە مەزهەب یانی شاخ و لقێك كەلێی جیا ئەكرێتەوە،خەڵك جیای ئەكەنەوە بەبۆنەی ڕاو بۆچونی خۆیانەوە، ئەمە جیاوازیەكی سادەیەوە، بەڵام ڕاستییەك لە بارەی هۆكاری پەیدابونی مەزاهیبە جیاوازەكانەوە لە ئیسلامدا، چاوەكەم ئەوەی وا لەتەرەف خواوە نێردراوە بۆ مرۆڤ، لەڕێگای حەزرەتی موحەممەد(صلی الله علیه واله وسلم)مەجموعەیەكە كامڵ و گشتی و تەواوەتی، نە بە شێوازی بەرنامە. لەژیانی مادديمانا ئێمە ئەبینین خوای گەورە زەمین و ئەوەی وا هەیە لە دەوروبەرمانا لە ئیختیار ئێمەیدا قەرارداوە بە شێوازی مەوادی گشتی و بە شێوازی كەرەستەی خام و گشتی، نە بە شێوازی مێزەكە و كورسیەكەو زۆپاكەو ڕادیۆكە، چونكە ئەگەر بەو شێوازەو بە شێوەی وەسائیلی جوزئی بێت، بەشێك بۆ مێشكی مرۆڤ نامێنێتەوە، لە كاتێكدا خوای گەورە مرۆڤی وا دروست كردوە مێشكێكی چالاك و بەتوانای هەیە كە ئەبێت ئیش بكات ئەگەر ئیش نەكات بێ سودە و پوچ ئەبێتەوە و هەر وەك ئاژەڵێك دێن و دەچن ئەمرن، بۆ ژیانی مەعنەویش خوای گەورە ئەم كارەی كردوە، كە غەیرە دینەكان هەر بە هەوڵ و فەعالیەت خۆیەوە پەیوەست بێ و هەر كار بكات، ئەمما چۆن بۆ ژیانی ماددی شتێكی گشتیە، مەوادە خامێكی بۆ

داناوه بۆ ژیانی مەعنەویش بەهەمان شێوەی ئەم ئیشەی کردوه، کار له ڕوی ئەو مەوادەوه بکات، نەیویستووه، هەروا لەخۆیەوه به خەیاڵ مەسەلەن ژیانه ماددیەکەی ئەگەر خوا زەوی نەدات به دەستیەوه چۆن کار بکات؟! چۆن چالاکی هەبێ و ئەم شتانه دروست بکات؟! وه چۆن ژیانی پێش بخات؟! له ڕوی مەعنەویشەوه هەر بەو جۆره ئەگەر مەوادێك خوای گەوره نەیخاته بەردەستی له ڕوی چیەوه کار بکات مێشکی؟! له ڕوی خەیالاّتی خۆیەوه؟! هەر ئینسانێ به تەناسوب خۆیاو ژیانی خۆیا بیرەکاتەوه، چۆن ئینسانێك بتوانێ بێ ئەوەی مەوادێکی گشتی له بەردەمیا بێت، لەلایەن کەسێکەوه که دروستکەری مرۆڤه دابنیشێت بەرنامەیەك بۆ ئینسان دابنێت که به کات و به شەبییەت سازگار بێت لەگەڵ تەبیعەتی مرۆڤدا، هەتا وەختێ پێویستی ئینسان و چارەی نەخۆشی ئینسان بکات، ئەگەر ئەو مەبانیه گشتیه له تەك خاوەن ئیختیاریدا قەرار نەگرێت موتەناسب، ئەوا واخۆی دەرکی ئەکا قەزاوەت ئەکا، مەسەلەن ئیسلاّحی ڕەنجبەر و زەحمەتکێش شاهیدێکه بۆ ئەم مەتڵەبه، دەردی واقیعیەتی ئینسانیەت نابینی ئەوەنەکه خۆی ئەیبینێ تەشخیسی ئەدا، وه لەو سنورەدا نرخی بۆ دائەنێ بەو دەلیله خوای گەوره بۆ ڕێکخستنی لایەنی ژیانی مەعنەویش دیسان هەروەك لایەنی ژیانی مادی، مەوادێکی بۆ ناردووه، ئەمما وەك خام وەك مەوادی کوللی که زیهنی خۆی دەخل و کەسابەتی تیا بکا، وه ئەوەی که پێویسته بۆ هەر کاتێکی به بەرێوەبردنی ژیانی مەعنەوی خۆی، سود لەو مەواده کوللیه وەربگرێت. شکڵی دین له ئەساسدا ئەم گشتیەتەیه، نەك شتی جوزئی و

بچوك بچوك، گشتیەتێك كە هیچ كات و هەرگیز ناگۆڕدرێت، چونكە گەر جوزئیات بێت ئەگۆڕدرێت، لە ژیانی مادیشدا هەر وایە، ئەم مەوادە كەوا هەیە لەم سەر زەویەدا بە شێوەی مەوادی خام و گشتی دروستی نەكردایە بە شێوەی جوزئی دروستی بكردایە ئیمكانی بۆ ژیان بچێتە پێشەوە مەگەرنا؟! بۆ ژیانی مەعنەویش هەروا، ئەگەر جوزئی و دانە دانەبێت پێشكەوتن نامێنێت، هەڵبەت بە ئیستسنایی شت گەلێك بە ژیانی ماددی و مەعنەوییەوە كە هەر بە شێوەی جوزئی و جوزئی نیهائی و مەسرەڤ لە ئیختیار ئیمكاندا قەرار دراوە، كە ئینسان تا كاتێك ئینسانەو پێویستی بەوانە ناگۆڕدرێت بە ئیستسنای مەواریدی جوزئی باقی تر، هەروا كە بۆ ژیانی ماددی خوای گەورە مەوادی گشتی لە ئیختیار ئینساندا قەراری داوە، بۆ ژیانی مەعنەویش دوبارە مەوادی گشتی لە ئیختیارا قەرار داوە، لەسەر ئینسان ماوەتەوە كە مێشكی بخاتە كار لەم مەوادە گشتیە ئەوەی وا بۆ بەرنامەی ژیانی مەعنەوییان لازمە سودی لێ وەرگرن، هەروەها كە لەبار ژیانی مادیەكەوە ئینسانی پسپۆڕ ئەم ئیشە ئەكەن ئەمە ئەو، ئەمما خۆ ئەمە ڕونە، كە ئینسان هەرچەند نزیكیش بن، چونكە بەگوێرەی ئەو قاعیدە وا وتمان، ئەوانە وا خۆیان دروستیان كردوە، وە بیركردنەوەیان شكڵی گرتووە پێی، وە ئیمكانی نیە دوو ئینسان بە تەواو بیركردنەوەیان وەك یەك بێت و تایبەتمەندێتیان وەك یەك بێت ئیمكانی نیە، هەتا دوو نەفەر كە دوانەش بن بەیەكەوە لەدایك بوون، ئەمانیش ئیمكانی نیە شێوەی بیركردنەوەیان وەك یەك بێت مەحاڵە، بەگوێرەی ئەمە ئیحتیمالی هەیە كە لەهەمان ئیخلاسیشدا ڕێگای بیركردنەوەیان تایبەت و جیابێت لەیەك، زیهنێك بە لایەكداو زیهنێك بە لایەكی تردا. هەروا كەلە

ژیانی ماددیا وایە، لە ژیانی مەعنەویشدا ئەمە بونی هەیە، هەڵبەتە جگە لەوانەی کە بە خیانەت وادەکەن لە ژیانی مادیدا، ئەبینین لەهەر مەسەلەیەکدا لە سەرەتادا تا بە شێوازی یاسایی ئاشتیانە و موحریس دەرنەهاتون، بۆ هەموو کەس هەر ئەبێ بیرکردنەوەی بەرەو بارێکی تر بچێ، جەماعەتێك لە ساحیب نەزەر بارێك تەسەور ئەکەن، جەماعەتێکی تر باریك تر جەماعەتی تر باریك تر، دوبارە لەناو ئەمانیشدا و لەناو تاکەکاندا کە بەخیانت شتێك ئەڵێن، ئەیانەوی سودی لێ وەربگرن، لەژیانی مەعنەویشدا هەر بەوجۆرە تاکی دوژمن کە بە ئەنقەست لەئەو ئوسوڵە گشتیە هەڵە ئەکەن، وە لە بەرامبەر ئەمانیش هەر ئینسانێك کە لە هەمان ڕاستگۆیی و دڵسۆزیدا بە دواداچون و موتاڵەعە ئەکەن، بەڵام هەریەکەیان بیریان بەرەو شوێنێك ئەچێت، چارەسەر لە دونیای ئێستا، دوای چوارده سەدە، لە یەکێ لەو بابەتانەدا تەماشادەکەین، مەسەلەن وەك شورای پزیشکی بۆ چارەسەری نەخۆش، یا بۆ خۆپاراستن لە بەڵا گەلێك پەتای گەورە کە بڵاو ئەبێتەوە لە وڵاتێکدا، یا مەسەلەن هەڵبەت نەبێتە تەشریفاتی ئیداری کە ئینسان تەهیدی بکات گوناهبار بێت، وەك شتێکی عیلمی کە لە دونیا تەشکیل ئەدرێت کە موخلیسانەو دڵسۆزانە هەوڵی ڕێکخستنی مەسەلەی عیلمی و چارەسەری کێشەکان بێت، ئێستا ئەمە ناسراوە بە ڕێگە چارەی کێشەکان، وە گەشتن بە ئەنجامێکی باش لە بەدواداچونەکاندا، خوای گەورە بەهەمان ئەم ڕێگەیەی دەستور داوە بەموسڵمانان، وە ئێمەی بەرپرسیار کردوە ئیدارەی کۆمەڵگاکەمان لە گەورەترین سئونەوە لە خەلیفە و ڕابەرەوە تا دەگەین بە بچوکترین

نمونە، بەس شورا بێت. ،شورا بە چی کاربکات؟! یەکەم بە کیتاب بەڵگەنامەیی قورئان و لەوەودوا بە سونئەت، ئەوانەی وا لەتەرەف پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه واله وسلم) ئەویش گشتی هەڵبەتە چونکە کەمێك جوزئییاتە، گشتیەکەیە بەس بە بەشی تر باسکراوە، لەدوای ئەوە ئیجماع یانی دوای گفتوگۆ و نەزەرو مشاوەرەکردن لەگەڵ یەکتردا لەسەر بابەتێك و گەیشتن بەئەنجامێك و ئیعلانکردنی بۆ خەڵکی، ئەوە بەهەمان شێوەی کیتاب و سونەت ئەرزشی هەیە بۆ موسڵمان و پەیڕەوی لەوە حوججەت و پێویستیەﮋ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الْأَمْرِ مِنكُمْ[١]﴾ کیتاب و سوننەت و ئیجماع، هەرچی لە کیتابدا هات پەیڕەوی لیٚ بکەن، هەرچی لە سوننەتدا هات پەیڕەوی بکەن، وە هەرچی کە ئیجماع ئیعلانی کرد و وەلی ئەمر ئەیلێت، هەڵبەت بەتەرکیزی شورا، بەو شەرتەی کە فەرمانەکانیان لە ڕێگەی شورا و ڕاوێژ و گۆڕینەوەی ڕاو بۆچون بێت، ئەوەی وا لە شورا ئیعلان ئەکرێت بە خەڵك، ڕێککەوتنی لەسەدا سەد یان زۆرینە لەسەری کۆکن و ناوی ئیجماعە، ئەوە وەك کیتاب و سوننەت واجبە پەیڕەوی کردنی، هەڵبەتە بەو شەرتە واقیعەن وەلی ئەمر بن. وەلی ئەمر خوای گەورە وەسفی کردون، زانابن بۆ کۆمەلگا و کێشەکانیان، شارەزابن لەکیتاب و سوننەت چونکە کیتاب و سوننەت بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەلگەیە، بۆ چارەی کێشەکانیانە، ئەگەر بارێکی نەزانن پوچە، هەر کیتاب و سوننەت بزانن، بەڵام کۆمەلگەی خۆیان نەناسن و کێشەکانیان نەناسن، وەك دکتۆرێك کەدەرمان لە دەسیا بێت بەلاّم نەخۆشێك شك

[١] سورەتی (النساء/٥٩).

نەبات، ئەم دەرمانە ئیتر بەکاری چی دێت؟! لەهەمان کاتدا هەر کۆمەڵگای خۆی بناسێت و کێشەکانیان بزانێت بەڵام لە کیتاب و سوننەت هیچ نەزانێت، ئەوا بەکەڵك نایەت، وەك دکتۆرێك نەخۆشی هەبێت، بەڵام نەزانێت ڕێی دەرمانی نەخۆشیەکە، شەرتە ئەم کەسەی وەلی ئەمر بێت ئەو سیفەتانەی تیابێت کە خوای گەورە باسی کردون، ئەگەر کێشەیەك بێتە پێشەوە لە کۆمەڵگەیا، داوا بکرێ لە ئەوان، ئەوان ئەتوانن لە کۆمەڵە شتێك کە مرۆڤی ئاسایی ناتوانێت سودی لێوەربگرن، لە کیتاب و سوننەت دەریبکەن ، واتە مومکینە خەڵکی ئاسایی کێشەیەکیان ببێت و نەتوانن لە کیتاب و سوننەت دەری بێنن، ئەمانە نابنە وەلی ئەمر، وەختێك ئەبنە وەلی ئەمر کە ئەوەنە توانایان ببێت، سەیری کۆمەڵگا بکەن و ڕێگەی چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگاکەیان بزانن، خۆیان لە کیتاب و سوننەتەوە بدۆزنەوە، ئینجا ئەبنە وەلی ئەمر.

واقیعی وەلی ئەمریش هەر ئەمەیە، چونکە بیرو بۆچونی هەڵەتان زۆر گوێ لێ بووە ئەبوبکر بە عینوانی خەلیفە وەلی ئەمر نیە، عومەر بە عینوانی خەلیفە وەلی ئەمر نیە، لە ئیسلامدا دوو هێزی بنەڕەتی ئیدارەی کۆمەڵگا ئەکات، ئەوانیش:

١. هێزی موقەنینە (شورا):

قورئان دەستوری داوە و دەفەرمێ کە ئیجماع و ئاڵوگۆڕی بۆچون و ڕا بکەن و بیروڕای کۆتایی ڕابگەیەنن و جێبەجێی بکەن.

٢. هێزی موجرییە (حوکمەت و دەزگایەکە کە وەلی ئەمر دایدەمەزرێنێ):

کەواتە ئەبوبکر ئیحتمالی هەیە خۆی لە وەلی ئەمر بێت، بەڵام بە ئیعتباری ئەوەی کە خۆی  هەیە لە هێزی موجرییەوە، ناتوانین پێی بڵێین وەلی ئەمر. ئەتوانێت خاوەن بۆچونی خۆی بێت، سەبارەت بە گیروگرفتەکانی کۆمەڵگا، بەڵام کاتێ ئەوەتا لەسەر هێزی موجرییەوە، وە یاسا جێبەجێ ئەکات، ئەبێ گوێڕایەڵی وەلی ئەمر بێت،  ئەویش لەو بازنەدا کە ئەو فەرمانە ئیلاهیە بەجێ بێنێ ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الْأَمْرِ مِنكُمْ﴾[1]. ئەبوبەکر مەجبورە ئیتاعەتی وەلی ئەمر بکات (واتە شورا) کە هێزی موقەنینەیە، چونکە هێزی موجرییە، گوێڕایەڵی فەرمانی هێزی موقەنینەیە لە ئیسلامدا، ئەم زاراوانە کە ئێستا لە یاسای بنەڕەتی ئێمەشدا هەیە، بەلاّم مەفهومێکی نیە.

ئەبوبەکر کاتێ لە هێزی موجرییە، وەختێ هەر خۆیی و شەخسی خۆی سەیر دەکەین بە ئیعتباری عیلمی و ئاگاهی نیسبەت بە کێشەکانی کۆمەڵگە شتێکی ترە، وەختێ لەم ئیعتبارەی دووەمەوە سەیری دەکەین لە وەلی ئەمرە، ڕاستە یانی لە ئەهلی شورا سەڵاحیەتی هەیە کە لە ئیجماعی موسڵماندا دابنیشێت وەك فەردێ، بەڵام لەم کاتەیا ئیتر ڕای هێزی موجرییە نیە، بەڵکو وەکو فەردێکی ئاسایی تەبادول نەزەر ئەکات، وەك باقی کەسەکانی شورا، کەسە ئاساییەکانی تر و ئەهلی شورا، هەڵبەتە ئەو عادییە واتە لە ڕیزی خۆیانا لە ئەم مەوزوعە خاریج بوو بە ئیعتباری ئەمەی کە ئەوە وا لە مەملەکەتا لازمە ئەشێ جێبەجێی بکات، ئیتر تازە وەلی ئەمر نیە، چونکە هەرکام بە ئیعتبارێکن، ئەم دوو هێزە، هێزی

---

[1] سورەتی (النساء/٥٩).

موقەنینە و موجرییە، نەهەر ئەبوبەکر هەر ئەفرادێك لە هێزی موقەنینە مومکینە بتوانن لە هێزی موجرییە بن  یانی کەسێ لە ئاگایی حکومەت، مومکینە بتوانن لە شوراشدا بن، یا کەسێك لە شورا مومکینە بتوانن لە حکومەتیشدابن و سەلاحەتییان ببێت، بەلام ئیعتباری شورا بونیان قودرەتی یاسا سەروەری و ئەمر و نەهی گشتیان پێ ئەدات، کە خەلیفەش و تەواوی باقی کەسەکانی تری حکومەتیش مەجبورەو ئەبێ ملکەچی ببێت، پابەندە و ئەبێ ملکەچی وەلی ئەمر ببێت، خەلیفەو ڕابەر و وەلی ئەمر نیە، وەختێك خەلیفە بێ موتیع و وەلی ئەمرە، ئەم دوو لایەنە ئا بەوجۆرە ئیمتیازات و تایبەتمەندێتی ئەم دوو هێزە لەیەك جیا ئەکاتەوە، خوای گەورە لەبەر خاتری ئەمە جۆریکی ئاسایی زیهنی مرۆڤ لە تێڕوانینی هەندێ بابەتدا دوچاری ئیختلاف ئەبێتەوە، نەك ئەوانەی وا لەڕوی خیانەتەوە ئەیکەن، هەرلەڕوی دڵسۆزیشەوە کاربکەن، یەکێ بەلایەکا ئەچێت و یەکێ بە لایەکی ترا، بۆ ئەمە ئائەم حاڵەتە تەبیعیە کە لەناو ئینساندا هەیە، ئەویش فەعالیەتی زیهنی مرۆڤە، کە خێرو بەرەکەتە بۆ ئینسانیەت، کە زیهن هەرکام بەرەو لایەك بچێت، ئەگەر مەجموعەن زیهنیان یەك شتیان وت،  ئەوە یانی مرۆڤایەتی نەماوە،  وەك ڕانێك کەر رانیك مەڕ ڕانێك گا شتێك بڵێن و هەموان بڵێن راستە!

ئینسانیەت کاتێ مەفهومی هەیە، وەختێ بایەخی ڕاستەفینەی هەیە  کە ئیختیلافی بۆچونی هەبێ، بەعزێ لە خەڵکی سەرگەردان بون، جیاوازی نێوان ئیختیلاف و تەفەروقیان نەزانیوە، پێغەمبەر(صلی الله علیه واله

وسلم) دەفەرموی (اختلاف أمتي رحمة[١]) لە کاتێکدا خودی پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم)و قورئان لەعنەت و نەفرین دەکەن لە تەفەروق فیرقە فیرقەبوون، نەیانزانیوە فەرقیان هەیە ئەم دوانە، ئیختلاف ئیعتبارە لەمەفعول وفەعالیەتی زیهن، زیهنی مرۆڤ وەختێ بکەوێتە کار ئەم بە بارێکا ئەچێ، ئەو بە بارێکا ئەچێت، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە مرۆڤ ئەتوانێت بیربکاتەوە و ئازادن ئیعلانی فیکر بکەن، ئەمە خۆشبەختی و سەعادەتە بۆ جیهان کە ئیختلافی نەزەر هەبێت جا چ گەورە بێت چ بچوك بێت.

حەزرەتی عومەر لە ئەم مەفهومە گشتیە گەورەیە سودی وەرگرتووە، یەك نەفەر خەریك بوو باسی لا دەکرد کە ئایا ڕەخنە بگرم یان نا؟ ئەویش فەرموی نەفرین لە کۆمەڵگەیەك کە ڕەخنەگرتنی تیا نەبێت وە نەفرین لەڕابەرێك کە ڕەخنەی قبوڵ نەبێت، من بیستومە لە پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم) فەرمویەتی ڕابەرێك ڕەخنەی لێ نەگیرێت و حازر نەبێت ڕەخنە ببیستێت، ئەوە شەڕ و بەڵایە بۆئوممەت. ئەمە مەرحەلەیەکە و تەفەروق مەرحەلەیەکی ترە، تەفەروق ئەوەیە کە لەبەر هەواو ئارەزوو نەهێڵێت ئەم بیروڕایانە ئاڵوگۆڕ بکرێ و ڕێگری بکات، ڕێگری بکرێت بۆ ئەمە کە ئاڵوگۆڕی بیروبۆچون بکرێت تا

---

[١] هەرچەندە مامۆستا ئەمەی وەکو فەرمودەیەك هێناوە بۆ تەئکید کردنەوە لەسەر جیاوازی بۆچون، بەڵام هەریەکە لە زانایانی وەك ئەلبانی و صاڵح فوزان و محمد حەسان ئەمە بە فەرمودە نازانن و پێشیان وایە پێچەوانەی ئایەتی قورئانیە، ئەمە جگە لەوەی ئەم دەقە نە سەنەدەکەی سەحیحە نە مەتنەکەشی.

بۆچونێکی چاك و مەحکەم دامەزرێ و پاشان ئیعلانی بکەن بۆ موسڵمانان، ئەوەی کە قورئان ناوی ناوە ئیجماع،  ئەمە بەدبەختی و فەسادە، وە گەورەترین زەلیلی و سەرشۆڕییە ئیختیلاف بۆچون ببێتە هۆی تەفەروق و جیایی، لە مێژوی ئیسلامدا سەیردەکەین تا کاتێ کە حکومەتی ئیسلامی  بونی هەبوو، خیلافەت بوو، تا کۆتایی دەورەی حەزرەتی عەلی، کۆمەڵگە بەم شێوازە بەڕێوەدەبرا، بەڵێ ئیختلاف بوو، وە کاتیك ئەفرادێکی  لە مەسیری ئیختلافەکەی خۆیاندا خەریك بوون بەرەو تەفەروق بڕۆن، بەتایبەتی لە سەردەمێکدا کە حەزرەتی عەلی گەیشتە خیلافەت،  معاویە و ئەشرافەکان لە مەلاکانی جاران کە حەزیان دەکرد مەلایین بێت و ئەشرافیەت زیندو ببێتەوە و حەزیان ئەکرد کە گروپ گروپ دروست بکەن، کە ئیسلام لە بەین بچێت و پلەو مەقام دروست ببێت و ژیانە خۆشەکەی جارانیان دروست ببێتەوە، کە بۆ میللەت ئەبوە ژەهرو تاڵی، بەڵام بۆ ئەوان خۆشە دانیشن لەسەر سفرەی ڕەنگاو ڕەنگ بلەوەڕن، باخەڵك زەجرو برسیەتی بکێشن، بۆ ئەوان بەو جۆرە زۆر خۆشە،  هەوڵیان ئەدا هەر لەسەردەمی خیلافەتی حەزرەتی عەلیشدا تەفەروق  دروست بکەن، وە تەقریبەن لە سەردەمی حەزرەتی عوسماندا خەریك بوون ئەمەیان بونیاد دەنا،  هەرکات مەلائیەت و ئەشرافیەت دروست ببێت، کۆمەڵگە دوچاری بەدبەختی دەبێتەوە، سادەترین تەفەروقی ئەوەیە، کە دوبارە دوو دەستە مەلا لەولاوە و موستەزعەفین لەملاوە، لە زەمانی حەزرەتی عوسماندا  ئەمەوییە لە پەیداکردنی نفوزدا بون، بەڵام لەبەرچاوی خەڵکە سادە نەئەبینران و

ئەیانوت قەیناکا با معاویە پارکێك دروست بکات لە شامدا کە ئەم هەموو پارەی هەیە! چۆن قەیناکا خوا وانافەرموێت خوا دەفەرموێت ئیتر تازە نیزام ئەگۆڕدرێت حکومەت موستەزعەفینە حکومەتی مەلائین و مەسروفین تەواو ئەبێت، بەئیسلام نیزام ئەگۆڕدرێت ﴿وَنُرِيدُ أن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ[1]﴾ ئەم بەرنامە ئینقلابیە بۆ ئەمەیە مێژوی ژیانی مرۆڤ بگۆڕدرێت. موستەزعەفین بونە ڕابەر، ئەمە خەسڵەتی حکومەتی ئیسلامی و کۆمەڵگەی ئیسلامییە. حەزرەتی موحەممەد(صلی الله علیه واله وسلم) یان هەرکام لە خولەفاو لەوە ئازیزتر (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) کە لەناو ئەمەویدا غەرق ببوو، لەناو زیادەڕۆیی ئەشرافیەتدا پەروەردە بوو، وەختێك ئەگاتە ڕابەری حکومەت، سەیر ئەکەیت لەناو ئەو پلەو مەقامەدا، ڕەنگی موستەزعەفین دروست ئەکاتەوە بۆخۆی، چونکە ئەگەر نا سەڵاحیەتی نیە، ئەگەر چی سەروەت و کاسبی و قودرەتی زۆر بێت، بەڵام گەر بۆ خۆی و ژیانی خۆی سودی لێ وەربگرێت، ئەوە فەردی ئاساییە، ئیتر هەڵبەت لە حەددی ناوەڕاستدا ئاساییە بۆ گشت کەس. لە ئیسلامدا لە مامناوەند زیاتر یانی دەرامەتی نیسبی هەر کەسێك و هەر بنەماڵەیەك هەرچەنێکی دەست ئەکەوێ هەر ئەوەنە ئازادە، لەوە زیاتر ئیسرافە و مەمنوعە، لە ئیسلامدا ڕێژەی مامناوەند تەنیا ئازادە، بەڵام بۆ ڕابەر مامناوەند ئازاد نیە و ئیجازەی نیە لە پلەی مامناوەندا ژیان بەرێتە سەر، ڕەنگە بۆچونی موستەزعەفینی بوێت، تا ئەوەی وا قورئان

---

[1] سورەتی (القصص/٥).

دەستوری داوە و ئەیکاتە هەدەف لە ئینقلابی ئیسلامیدا هەمیشە دیار بێت و مەعلوم بێت، حکومەت حکومەتی مستزعفینە.

هەیبەتی عومەر دونیای لەرزاندبوو تەختی ئیمپڕاتۆری ڕۆم و ساسانیانی لە ئێراندا لەراندبویەوە، تەمەلوقیان ئەکرد ڕیایان ئەکرد و تەزاهوریان ئەکرد، یەکێك لە هاوڕێ و هاودەمە تایبەتەکانی سەڵتەنەتی ڕۆم، کە فێری قسەو گفتوگۆ و دیدار بوو لەگەڵ پیاوان، کەوتە ڕێ لە ڕۆمەوە بۆ دیداری عومەر، کۆمەڵێك دیاری پێبوو لەلایەن ژنی ئیمپڕاتۆری ڕۆمەوە بۆ ژنی ئیمپڕاتۆری ئیسلام، لە جەواهیرو خشڵی گرانبەها، کەوتە ڕێ و هات بۆمەدینە، لەوێ پرسیاری کرد ماڵی عومەر لەکوێیە؟! ڕێنوێنیان کرد، سەیر بوو لای کە شوێنەکە لە شوێنی ئیمپڕاتۆر نشین نەئەچوو، وتیان ئێرەیە بە پرسیار کردن، ئەوەتا لەو کۆلانەیا، ئەم کۆلانە؟! ناکرێ ئەمە ڕاست نیە، ئەزانم گاڵتەم پێ دەکەن و ئەزانن غەریبم، چەند جاری تر پرسیاری کردەوە، هەر هەمان شوێنیان نیشاندا، لەدڵی خۆیدا وتی گەر مەبەستیان گاڵتە بوایە چۆن هەمویان هەر یەك شوێن ئەڵێن، کاتێ کە ئیتر دڵنیابوو کە چارەی تری نیە غەیری باوەڕکردن، چووە کۆلانەکە و پرسیاری کرد، ماڵێکیان نیشاندا ! ئەی هاوار خوایە، خۆ ئەم ماڵە لە هەموویان خراپترو وێرانترە، چۆن ئەبێ شتی وا هیچ نەبێ ئەمەیان درۆیە، گەر ئەوانی تر ڕاست بوبێت ئەمەیان نابێت ڕاست بێت، تەقە بە لەم ماڵ تەقەبە لەو ماڵ هەمووی هەر ئەڵێ ئەوەیە ماڵی عومەر ! ئەو شتێکی تری بینیوە، ئەم هەموو ئینسانە لەبەینی شەڕی ئێران و ڕۆما ئەکوژران، لەبەرخاتری ئەوەی ئیمپڕاتۆری ڕۆم و شاهەنشای ئێران

خۆشی لێ بگوزەرێت، چۆن جەنابی ئیمپراتۆری ئیسلام بەو هەموو گەورەییەوە کە ئیمپراتوری ئێران لەبەری ئەلەرزن، ئەمە ماڵی بێت! ناکرێت چۆن من کەسێکی ڕاستگۆ بدۆزمەوەو ناونیشانێکی ڕاستم پێ بدات! ڕەنگە بترسن کە من غەریبەیەکم و نیەتێکم هەیە وا ڕاستی ناڵێن، بەڵام هەر پرسیارو گەران، نەخێر دەرکەوت کە درۆ نیەو ڕاستە، ئەمە ڕاستیەو ماڵی عومەرە، کورە حەتمەن ئەمە شێتێك، شتێکە خەڵك ناویان ناوە ئیمپڕاتور، چۆن کەسێك بەو هەموو گەورەییەوە لە ماڵێکی وادا ئەژێت، تەقەیدا لە دەرگا، کوێیە؟! ماڵی عومەرە، عومەر لەماڵە؟! نەوەڵا، لە ماڵ نیە، ئەی لەکوێیە؟! چووە بۆ ئاوداری باخی بەیتولمال، عەجیب!! هەڵبەتە چووە سەرپەرشتی باخەوانەکان ئەکات، بەیتولمال یانی چی؟!

ئەو کۆمەڵگە گەورەیەی بەڕێوە ئەبرد، سەیرکە جیاوازی بەرنامە، ئەو کۆمەڵگە گەورەیەی بەڕێوە ئەبرد، ئەچوە دارولخیلافە یان هەر مزگەوتی ئیسلامی، هەموو شتێك هەر مزگەوت بوو، مەدرەسەی فەرمانگەی قەزایی، فەرمانگەی سیاسی، فەرمانگەی کۆمەڵایەتی، فەرمانگەی جەنگی، تاعەت عیبادەت، مزگەوت یانی ئەوە، لە ئیسلامدا هەموو شتێکە، کە پێویستی ئیسلامی لازمیە.

وەختی بێکاری چی بۆ ئەمایەوە؟! چ کۆمالگەیەکی گەورە! بیری لێبکەرەوە ئێستا بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەیەك چەند کات بەفیڕۆدەچێت، کابرایەکم دی لە کەیهانا مەقالەیەکی نوسیبوو، شتێك لە ئیستەی عەرەبستانی سعودی کە هەڵبەت میللەتی موسڵمان لەگەڵ ڕابەرەکانی خۆیانا، ڕابەرە ڕۆحانیەکانیان، وە ئیلا حکومەتیان ئەوەیە کە ئەیناسین، وە بەراوردی بە دادگا لەگەڵ دادگای ئێراندا زۆر جوان بوو! جا

ڕاستیەکەشی ئەوەیە کە من خۆشم دیومە لە دادگای ئێرەدا، بڕوا ناکام نەفەرێك ڕوی تێ بکات، مەگەر بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی بڕوا، باوەڕناکەم لە مانگی جارێکا یەك کەس سەربکات بە دادگادا، چونکە پێویستیان نیە، جگە لەوەش ئەم کۆمەڵگەیەی ئێستا لە کوێ و هی سەردەمی خیلافەتی ئیسلامی ڕاشیدین لە کوێ! ئەو کۆمەلگا گەورە ئیدارە ئەکاو نایەڵێت کاتی زیادەی هەروا بڕوات و لەماڵ بخەوێت، نا! ئەڕوا بۆ بەیتولمال کە دەرامەتی هی بەیتولماله و هی هەموو موسڵمانانە، من خزمەتگوزاری موسڵمانانم، ئەڕۆشت لە باخی بەیتولمالا خاکەنازەکەی ئەدا بە شانیا، جەنابی ئیمپراتۆری ئیسلام بەناو کوچەکانا قۆڵی لێ هەڵئەماڵی و قولی لێ هەڵئەکرد، بە کراسە پینە پینە کراوەکەیەوە، دەی یەڵلا بڕۆ بۆ ئاوداری باخ، ئەچوو ئاوداری ئەکرد، تا دوای ئەوەی هەندێ ئیشی ئەکرد، یا ئەگەر بیویستایە دوای ئەوە ئاو بڵاوبێتەوە بۆ بەشێکی تری ئەهاتەوە بۆ ماڵەوە کرێکاری ئەکرد، یا گەر زۆر هیلاك بوایە لەسەر خاکی باخەکە خاکەنازەکەی ئەخستە ژێر سەری و ئەخەوت. وەختێ نێردراوی ئیمپراتۆری ڕۆم کەوتە ڕێ و باخەکەی دۆزییەوە، هات و لە قەراخ باخەکەیا سەیری کرد ئاو دابەشی باخەکان کراوە جوان، کەسێکی شڕو وڕ خاکەنازێکی خستۆتە ژێر سەری و خەوی لێ کەوتووە، بۆ یەکەمین جار بڕوای کرد کە عومەرە، کە هەیبەتێکی هەبوو ئەم مرۆڤە خەوتووەو لەرزی پێکەوت و موچرکی پێدا هات، خۆی ئەڵێت دەستی کرد بە ڕەخنە لە خۆی، ئێ خوێری نێردراوی ئیمپڕاتوری تۆ، قومارو گاڵتەو فشقیاتت لەگەڵ ئیمپراتۆرا کردوە، ئێستا لە بەرامبەر کابرایەکی فەقیرو شڕ کە

خاکەنازەکەی لەژێر سەریایە و لەسەر خاك خەوتووە، ئەلەرزی؟! فایدەی نەبوو! هەرچەند تەشجیعی خۆی کرد، خۆی ئەڵێت کە نا قودرەتی ئینسان شتێکی ترە! تێگەیشتم کە ئا ئەم قودرەتە وا ئەم هەیەتی، غەیر ئەم قودرەتە ئیمپراتۆرەکان بوویانە و من نیمە، ئەم قودرەتە ئا ئەم هەیبەتە سەلیمانەس، وەلێ ئەوساکە گیر ئەبێ و نازانێ چ بکات! لەم حاڵەتەدا ئەبێ کە عومەر بەخەبەر دێتەوە، بەهەرحاڵ ئەبینێ کابرای ڕۆمی دیارە غەریبەیەکەو بەسەرو هەیئەتێکەوە کە کۆمەڵگەی ئیسلامی سەروسیما و جلوبەرگی وای تیا نیە، بانگی ئەکا سەیر ئەکا ئەلەرزێ، میقدارێ مەحەببەتی پێ ئەدا تا کابرا لە سام و هەیبەت لە دڵی لاچێ و بانگی ئەکات، بەڵام ئەو هەر لە بەرامبەریەوە ڕائەوەستێ و ڕائەوەستێ و ڕکوع ئەکا، جا پێی ئەڵێ کورە مەکە برا، بەنی ئادەمم، وەرە دانیشە برا، بۆ ڕائەوەستی لەبەرامبەرمەوە، بۆ ڕکوع ئەکەی؟! بێ دانیشە کورە مەکە برا، بەهەزار ئەمسەر و ئەوسەر هێنایە لای دەستیەوە داینا، کابرا دەستی کردە قسەو باسێك دابویان پێی، جا لەوەو دوا وتی قوربان دیاریەکیشم لە خانمی ئیمپراتۆری ڕۆمەوە هێنابوو بۆ حەزرەتی خانمی ئیمپراتۆری ئیسلام، چومە ماڵتان و داومە پێیان. جا لێرە مەبەستم ئەم خاڵەیە:

عومەر گەڕاوە بۆ ماڵ، ژن تەماشا ئەکا کەیف خۆشە، بەهەرحاڵ ناتوانێ بەقەد عومەر گەورە بێ، هەرچەند بەشەخسیەتیش بێ، بەڵام ژنان زیاتر ئارەزویان هەیە، ئارەزوی ماددی و دونیایی بەشێوەیەکی گشتی تا پیاوان، پیاوانیش هەموی عومەر نەبووە، یەکە یەکە عومەر بووە، ژن عەجیب پێی خۆشە تەماشای ئەو خشڵ و جەواهیراتە کە بە عومری نەیدیوە، بەخۆشی خۆشیەوە وتی عومەر تەماشاکە چ شت گەلێکم بۆ هاتووە بە

دیاری، وتی ئەمە لە ژنی ئیمپراتۆری ڕۆمەوە بە دیاری هاتووە بۆ من، وتی جا ئەزانی ئەمە هی تۆ نیە؟! ئەمە هی موسڵمانانە و پەیوەستە بە بەیتولمالەوە! وتی چۆن عومەر دانیشە بۆ منی ناردووە، وازبێنە! عومەریش فەرموی من ئێستا ئەگەر کاربەدەستێکی سادە بوایەم، ئەم دیاریە لە ژنی ئیمپراتۆری ڕۆمەوە ئەهات بۆ تۆ؟! ئەوە لەبەر قودرەتی کۆمەڵگەی ئیسلامیە ژنی ئیمپراتۆری ڕۆم، بەوەزیفەی ئیمپراتۆری هەڵدەستێ و دیاری وا ئەنێرێت بۆ تۆ، بۆ ئەوەی بەش تۆ هەڵگەڕێیتەوە لە من و منیش لەبەرامبەر زوڵم و زۆر و گەندەڵیاندا کە دەرهەق بە مرۆڤ ئەیکەن بێ دەنگ و بێ قرە دابنیشم، هەموو هەیبەت و لێپرسراوێتی خۆم و کۆمەڵگەی ئیسلامی وێڵ بکەم، ئەو دیاریە بۆ کۆمەڵگەی ئیسلامە و پەیوەستە بە بەیتولمالەوە. ژنەکەشی بڕێك گلەیی کرد و وتی عومەر گیان فرە سەختگیریمان لێ ئەکەی، نابێ خۆش بگوزەرێنی، بەلاّم عومەر وەلاّمێکی توندی پێداوە و وتی وەزیفەی من چاودێری کردنی کۆمەڵگایە، نە خۆشگوزەرانی ژن و منالّم، من وەختێ کرامە خەلیفە بەرپرسیارێتیم پێ دراوە بۆ ئیدارەی کۆمەڵگا، ئا بەم جۆرە عومەرو باقی خولەفای ڕاشیدین ڕەنگی هەژار و مەینەتبارانیان لە حکومەت و دەزگای خۆیاندا هێشتووە، لە حالّێکدا فرە سادە سادە ئەگەر کەیفیان لێبوایە ئەیانتوانی ئەوەی وا لە خۆشی ماددیانەی ژیان هەیە بەدەستی بێنن.حەقیقەتیش ئەمەیە لە دونیای ئەمڕۆدا، ئەو هێزەی ئەو کاتە عومەر هەیبوو نیسبەت بە ئێستە هیچ هێزێك نەبوو لەبەرامبەریەوە، هەمویان لەبەرامبەریەوە دەستەوسان بون، بەلاّم بۆ

خۆی تا ئاخیری ژیانی بەو جلە شڕانەوە ژیا، ڕەنگی هەژارانی پۆشی، بە برسێتی ژیا، هەر لەو کاتەوە بووە ڕابەری حکومەتی ئیسلامی لە ڕۆژێکدا پێنج تیکە نانی زیاتر نەئەخوارد، بۆ ئەوەی ڕەنگی هەژاران هەر بمێنێ، بۆ ئەوەی سەلاحیەتی ڕابەری کۆمەڵگەی ئیسلامی هەر بمێنێ، ئەگەر وا نەبێ ئەو سەلاحیەتەی نامێنێ.

ئەو بەرنامە وا قورئان هێناویەتی، وە سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم) زۆرێکی لێ ڕونکردۆتەوە، گۆڕیویەتی لە نمونەیەکی گشتیەوە بۆ وێنەیەکی بچوکتر و بچوکتر، شورا دەسەڵاتی ئەمەی هەیە لێی تێبگات و دەرکی بکا و پاشانیش بڵاوی بکاتەوە لە کۆمەڵگادا و کۆمەڵگاش پێویستە لەسەری ئیتاعەتی لێ بکات. بەلام لە کاتێکەوە ڕەنگی حکومەت گۆڕدرا، معاویە بوو بە ڕابەر، ئیتر ئەشرافیەت دروست بۆوە، ئیجماع لە ڕێگەی ئیسلامدا تەواو بوو، وەختێ ئیجماع نەمێنێ چی پێش دێ؟! نمونەیەکی بچوك دێنمەوە:

ئەگەر پزیشکانی ئەم شارە، سەبارەت بە نەخۆشیەکانی ئەم شارە، هەمویان بەیەکەوە بن و ئاڵوگۆڕی بۆچونەکانیان بکەن و ڕێنماییەکان بڵاوبکەنەوە و ڕەوشی چارەسەر نیشان بدەن و ئیعلان بکەن، مرۆڤەکان هەمویان بەیەك ڕێگادا ئەڕۆن، بەلام ئەگەر خوا نەکردە هەریەکەیان بۆ خۆی بێت و چارەسەری تایبەت بە خۆی هەبێ، وەك فلانە شێخ، فلانە مەلا، کە ئەوانیش بونەتە بارگرانی بۆ سەر خەڵك، وە هەر یەکەیان ژمارەیەك بۆ لای خۆیان ڕابکێشن، بە دڵنیاییەوە لەڕێگەی دەرمانی نەخۆشیەکاندا ئیختلافی بۆچون پێش دێ، تەفەروق پێش دێ. ئیدارەی مەعنەوی کۆمەڵگاش هەر بەم شێوەیە، وەختێ حکومەتی معاویە هاتە

سەر کار و خیلافەت لە بەین چوو، سەڵتەنەت دامەزرا، ئیجماع تەواو بوو، وەختێ ئیجماع تەواو بوو، بەرپرسیارێتی یەکە یەکەی کەسەکان بە ئیعتباری ئاستی زانستی و ڕاوبۆچونیان، ئەمەیە کە لێکدانەوە بۆ کێشەکان بکەن و چارەسەریان بۆ بدۆزنەوە، لە کیتاب و سوننەت چی دەردێنن بیڵێن بە خەڵك، بە ئیعتباری یەك زانا هەر ئەوەیان بۆ ئەمێنێتەوە. بەڵام بۆ نمونە شافیعی یا فلاڵنە زانای تر یا موجتەهیدێکی تر، ئەتوانێ شورا دروست بکاتەوە، لە حاڵێکدا حکومەت ناهێڵێ؟! ناتوانێ! بەڵێ ئەمە بەرپرسیاریەتیەکی گەورەیە بۆ تەواوی کۆمەڵگا، بۆ شافیعی و باقی زانایانی تریش کە نەیەڵن کۆمەڵگەیان بەو جۆرە بێت، بەرپرسیارێتیان ئەوەیە کە کۆمەڵگا جارێکی تر بخەنەوە سەر ئەو ڕێکخستنەی شورا کە ئیسلام ئەیەوێت، بەڵام وەختێ نەتوانن ئەو کارە بکەن، وەختێ هیچ قودرەت و دەسەڵاتێکیان نیە بۆ ڕوبەڕوبونەوە، وە ئیمام ئەحمەد یەکێ لە ڕابەرانی ئێمە، بە ستەم ئەکوژرێ، شافیعی و ئەبو حەنیفە ئەنواع ئەشکەنجە قبوڵ ئەکەن، ئەو بەیانەش نەکات، ئیتر چی بکات؟! کەمترین شت ئەوەیە کە بۆچون و ڕاکانی خۆی ئیعلان بکا، ئەگەر ئەمەش نەکات پوچەوە ئەبێت. بۆچونەکان ئیعلان کران، وە میللەتی بێچارە، وەك ڕانێك گورگ لێی دابێت، کە معاویە و ئەمەوی و عەباسیان ئەو گورگە بون دایان لەو ڕانەمەڕە و تەفەروق و سەرگەردانیان کردن، لەهەر لایەك دەنگێکی گوێ لێ ئەبێت، جەماعەتێکی بەرەو لائەچێت، دوچاری ئەم وەزعە بون، ئەگەر حەقیقەتت ئەوێ، بە پێوانەیەك کە قورئان نیشانی ئەدا بە ئێمە، ئەمە ئیسلام نیە، ئەمە تەفەروقە، هەتا

گروپەکانی سوننی، شافیعی لەبەرامبەر حەنەفیەوە، حەنەفی لەبەرامبەر مالکیەوە، مالکی لەبەرامبەر حەنبەلیەوە، ... هەموی تەفەروقە، ئەوەتا نەعلەتی لێ کراوە، ئیدی ئەوە بەبێ خۆی شیعەو سوننی، یا ئەوە بە بێ خۆی مەسەلەن موسڵمان و ئەو گروپانە، بەتەواوی ڕوی ئیسلامیان لێڵ کردووە، یا مەسەلەن دەروێش و سۆفی و... ئەوانە بێئەوەی بزانێ، گروپی جیاوازی سوننی لەبەرامبەر یەکەوە دروست بون و ئیختلافیان گەیشتە حەدی تەفەروق، ئەو دەستەیەکە ئەو دەستەیەکە... وەختێ ئیختیلاف ئیختیلافە، کە کاریگەری کۆمەڵایەتی بە شوێنەوە نەبێ، شوێنگەیەکی لەناو کۆمەڵگادا نەبێ، ئاڵوگۆڕی بۆچون بێ، تا لەوەو دوا بە ئیجماع یەك ئەنجام ئیعلان بکرێ بە خەڵك. ئەگەر کاریگەری کۆمەڵایەتی پەیدا کرد، هەردەستەیەك بەشوێن یەکێکداو دەستەیەك بەشوێن یەکێکدا، لەو وەختە بە دڵنیاییەوە ئەبێتە تەفەروق. واقیعیەت ئەمەیە، ئێمە ئێستا نەفرین لێکراوین بە تەفەروق، وە بەم سەرگەردانیە وا هەمانە، ئەوەنە دوور کەوتوینەتەوە لە ئیسلام، هەر بەبۆنەی ئەوەوە بوو وا گورگ دای لێمان، بەبۆنەی ئەوەوە بوو دوچاری تەفەروق بووین. ئا ئەم مەزهەب مەزهەبە، گیانی تەفەروقە، چونکە لە حەدی ئیختیلاف دەرچووە، مەزهەب مەزهەب دروستکردن، موخالیفی دینە. دین ئەبێ هەریەکێ بێ، ئەبێ هەر یەك واحد بێ، بەڵام لەتەك سەردەم و کاتی جیاوازدا، لەو کەرەستە گشتیە وا هەیەتی، ئەوەی وا پێویستە بۆ ئیدارەی ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵگا دەربهێنرێت و جێبەجێ بکرێت. نابێ مەزهەب دروست بێت، دروستکردنی مەزهەب، دوو هێڵی یەکسان بوو لەتەك وێڵ کردنی دیندا، واقیعیەتیش ئەوەتا ئەیبینین لە کۆمەڵگای ئێمە هەر باس لە

مەزهەبە، تەواوی ئەو وتار و گفتوگۆیانەی ئەیانبیستین لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکاندا هەمویان وتاری مەزهەبین، ئەشعاری مەزهەبین، بەرنامەی مەزهەبین، مێزگردی مەزهەبین، نە هەر شیعە، سوننەیش هەروایە، مەزهەب مەترەحە نەدین، کێ کاری هەیە بە کیتاب و سوننەتەوە؟! کار ئەوەیە کە فڵانە کتێب چی وت! فلانە کتێب چی وت! ... کە زانایانێك لەو گروپانە نوسیویانە، یا لەو گروپە یالەو گروپە، ئەمە چاوپۆشیکردن لەوە کیتاب و سوننەت چەند نەفرینیان کردووە، خودی موجتەهیدینی گەورەی سوننە، خودی شافیعی کە ڕابەری مەزهەبی ئێمەیە، نەفرین ئەکا و لەعنەت ئەکا لەو زانایانەی وا قسەی ئەو ئەکەنە ئەسڵ و ئەکەونە شوێنی، قورئان و سوننەت وێل ئەکەن. دەی فەرموو بپرسە لە مەلایەکی ولأتی ئێمە، پێی بڵێ ئەوە قورئان وا ئەڵێ و حەدیسی پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم) وا ئەفەرمێ، ئەی بۆ ئیعلانی ناکەی بۆ خەڵکی و تێیان ناگەیەنی دوابڕاو، ئەڵێ جا ئاخر فلانە کتێب وا ئەڵێ، ڕووت ڕەش تۆ مەگەر شوێنکەوتەی قورئان و شوێنکەوتەی سوننەتی پێغەمبەری (صلی الله علیه واله وسلم) یا شوێنکەوتەی فڵانە کتێبب؟! ئەگەر فلأنە کتێب هەڵەیەکی تێدابوو، بە چی ڕاستی دەکەیتەوە؟! وەختێ تۆ هەواڵت نیە لە کیتاب و سوننەت. زانایەکی شیعە تەشەرێ خۆشی دابوو لە تەبرێزدا لە سونیێ وڵاتی کوردەواری ئێمە، وتبوی: "ئێوە بە درۆ ئەڵێن ئێمە موسڵمانین، موسڵمان ئەوەتا شوێنکەوتەی کیتاب و سوننەت بێ! بەدرۆ ئەڵێن شافیعی مەزهەبین، درۆ ئەکەن کەستان خەبەری لە کتێبی شافیعی نیە، کەستان نازانێ شافیعی

چی وتووه، کەستان ناکەوێتە شوێن قسەی شافیعی". جا ڕاستیش ئەکا واقیعیەت ئەوەتا، کوا ئەم مەلایانە شوێنکەوتەی شافیعین؟! شافیعی لەعنەتیان لێ ئەکا چون شوێنکەوتەی شافیعین، لە حاڵێکدا لەعنەتی شافیعی لە ملیانە، چونکە ئەمە شوێنکەوتن و پەیڕەویە، هەربۆیە ئەوانە موخالیفی لە فەرمانەکەی ئەکەن، لەعنەتەکەشی لە گەردنیانە. وەختێ تەفەروق بەدی هات، مرۆڤ دوچاری ئەنواع سەرگەردانی هات، کە خۆیان بەناو ئەهلی مەزهەبێك ئەناسن، لە حاڵێکدا ئەوەی سەر مەزهەبە نەفرینیان ئەکا، بۆ نمونە شافیعی نەفرینی ئەوە ئەکات کە مەزهەبێك دروست بکەی بە ناو مەزهەبی شافیعی، ئەبو حەنیفە نەفرین ئەکات کە مەزهەبێك دروست بکەی بە ناو مەزهەبی حەنەفی،...

خۆمان بە موسڵمان ناو ئەنێین، لە کاتێکدا مەزهەبیش نین چ جای دینی، بەو جۆرە لە سەرەتاوە ئاماژەم پێدا، ئیمام مالك ئا ئەو وەختە هاواری کردووە چ جای ئیستای ئێمە! کە هیچ موسڵمانیەتیەك لە ناو کۆمەڵگەماندا نەماوە، بە بۆنەی چیەوە؟! بە بۆنەی ئەوەی ئیجماع شێوێنرا! جا مەسەلەکە فرە سادەیە، هەر ئەو ئەسڵە وا باسم کرد لە زانستە جۆربەجۆرەکانی دونیای ئەمڕۆشدا ئەمە دەرك کراوە، بەڵام نەك بەو کەڵەك و تەزویرە کە لە دونیای ئێستادا هەیە، مەردووم خەلەتاندن، یەکجار بە زۆر بونە ساحێب قودرەت و دەسەڵات، یا بەیەکجار دیموکراسی هەڵخەڵەتێنەرانە بونە خاوەن پەرلەمان، نا! ئەوە ڕاستە کەوا ئیسلام ئەیڵێت، ئەوان واقیعەن لە ناخی دڵەوە خەڵکی ئەزانن کە ڕاستگۆ و نیەت پاکن، شارەزان لە بەڕێوەبردندا، ئەوانە ئاگای شوران و بۆچونی ئەوان باوەڕپێکراوە.

لەهەر سەردەمێکدا کۆمەڵگای ئیسلامی بیەوێت لە مەزهەب ڕزگاری بێت و بکەوێتە شوێن دین، یانی ببێتەوە بە موسڵمان، ئەبێ ئیجماع دروست بێتەوە، ئەو ڕێگە وا ئێستا مرۆڤ بۆ چارەسەری کێشە زانستیەکان دۆزیویانەتەوە لە دونیادا، یا بۆ ئیدارەی ڕێکخستنی کۆمەڵگاکان، بەڵام هەڵبەت هەڵخەڵەتێنەرانەیە. لە نیزامی دیموکراسی سیاسی یا ئابوری، کە دیموکراسی سیاسی ئەوەیە کە لە نیزامی سەرمایەداری ڕۆژئاوادا بونی هەیە، وە دیموکراسی ئابوریش ئەوەیە کە لە نیزامی کۆمۆنیستیدا هەیە، بەڵام هیچ کامێکیان ڕەنگی دیموکراسیی هەمەلایەنەی ئیسلامیان تیا نیە، هەڵبەتە جیاوازیان لەوەدا هەیە کە دیموکراسی ڕۆژئاوا بەتەنها لەلایەنی سیاسیەوەیە، ئەوەتا تەماشا ئەکەی کابرا وەختێ ناڕازیە لە شتێك، ئەچێ خێرا و بە ئاشکرا نەفرین ئەکات و هاوار ئەکات، ئازادە و هیچ کێشەیەکی نیە! یاخود لە نیزامی کۆمۆنیستیدا، تەنها دیموکراسی لەبواری ئابوریدا هەیە، ئەویش نە بەتەواوی و واقیعیانە، بەڵکو بەشێوەیەکی ڕێژەیی لە هەندێ وڵاتی کۆمۆنیستیدا هەیە، بەڵام چینایەتیشی تێدایە، تەنها ناوەکەی گۆڕدراوە، جۆرێك لە زیادەڕۆیشی تێدایە کە ئیسلام نەفرینی ئەکات، بەڵام لای ئەوان هەیە و ماوە. بەنمونە وەك ئەوانەی پلەی گەورە گەورەی زانستی و سیاسیان هەیە، وەك سەرۆکی زانکۆ و سەرۆك و ئەندامانی پلە باڵاکانی حیزب، ئەوەتان لە چینی ئەشرافیەت و زیادەڕەویدا، زیندەگیان سەخت نیە، لەبەرامبەردا مرۆڤی تر هەن لە ماڵی دارین و لەسەر جادەکان ژیان ئەگوزەرێنن، بەهەمان شێوەی سەردەمی جاهیلیەت، لە هەندێ لە نیزامی کۆمۆنیستیشدا کە کەمێك لە

شورەوی جیاوازترە، دوبارە چینایەتی هەیە، ئەوە وا قورئان نەفرینی ئەکات، ئەشراف لەلایەك، هەژار و مسکێن لەلایەك، لە خۆرئاواشدا ڕۆشنە و هەموو کەسێ شارەزایە کە چۆنە!

بەڵام لە دیموکراسی ئیسلامیدا جۆرێکی ترە، سەرەتا دیموکراسی فرە لایەنە، پاشانیش دیموکراسیەکە ڕوکەشانە و هەڵخەڵەتێنەرانە نیە، بە زۆر و بە پارە کۆمەڵێ ببنە خاوەنی ئەمر و نەهی، وە تەنها ئەمانە خاوەن بۆچون بن، یاخود بە پارە و پوڵ مرۆڤ بخلەتێنن، یاخود بە چاپکردنی وێنەی فلانە کاندید و دیاری کردنی لە فلانە پۆست و مەقامدا و ناساندنی وەك شارەزا لە بەڕێوەبردنی ئەو کارەدا، بەو جۆرە دەنگی خەڵکی ئەستێنن! ئینسانێ کە ئا بەو جۆرە وێنەی کابرا ئەبینێ لە پاڵ وێنەی ئافرەتێکی جواندا، ئەڵێ وەڵا ئەمە پیاو خاسێکە و بەکەڵکی ڕابەری دێ! ئەمرۆ لە ڕۆژئاوا کە لەزاری خۆیانەوە دیموکراسی سیاسی و کۆمەڵایەتیان هەیە، ئا بەو جۆرە دەنگ ئەستێنن! ئەم جۆرە دەنگە هیچ بایەخ و ئەرزشێکی نیە لە ئیسلامدا، چونکە ئیسلام هاشەو وش ناکات و مرۆڤ ناخەڵەتێنێ، دەرمان دائەنێ بۆ چارەسەری هەمیشەیی، ئیتاعەی پەنجاو یەك لەبەرامبەر پەنجاوە نا! تەنها ئیتاعەی وەلی ئەمر، زانایانی دڵسۆز و شارەزا. معاویە ئاو و گۆشتی بۆ خەڵکی میسر و عێراق و ئێران دروست ئەکرد و ئاڵتونی تێئەکرد، هەموویانی سەرسام ئەکرد، چونکە هیچ شارەزاییەکی وایان لە دیندا نەبوو، ناحەقیشیان نەبوو کە سەرسام بن، چونکە ئەیاندی معاویە زۆر لە پاشایانی ڕۆم و شاهەنشای ئێران و پاشایانی میسر چاکترە، ئەوە پێشینەی زیهنیان بوو، ئێستاش بۆتە معاویە و ئاو و گۆشتیان پێئەدا، کاتێ ئەیخۆن تەقەی دانیان دێ و ئۆف ئۆف

دەری دێنن، ئەھ خۆ ئەمە ئاڵتونە، ئیتر زیللەت و تێهەڵدان هەموی قبوڵ، معاویە بە گەردنم تۆ لە حەق ئەولاتریشی! لە گشت کەس سەروتری! بەلاَم ئەوە دەنگدان و بۆچون نیە، ئەوە گاڵتەکردنەو هیچ نرخێکی نیە.

ئەنجام دەگەینە ئەوەی دروستبونی مەزهەبەکان، چ سوننی بن یان شیعی، بە چاوپۆشی لەوەی بەلگەی کامیان بەهێزتر و کامڵترە، هەمویان فاسید و بەتاڵن، مەزهەب هەرچیەك بێت بەتاڵە، نابێ ببێ، ئەبێ ئیسلام ببێت، چارەسەر بۆ ئەمەش زیندوکردنەوەی ئیجماعە، واتە زیندوکردنەوەی ئەو شورا گەورە و بەهێزە کە ڕاوبۆچونەکانی ببنە یاسا و سەرمەشقی ولاَت. شیعاری موسڵمانی ڕاستەقینە و بەرپرس ئەمەیە لە دیندا ﴿وَمَا لَكُمْ لاَ تقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ[1]﴾ واتە:"چۆن ئەتوانن گیان بازی نەکەن، لەبەر خاتری بەرنامەیەك خوا ناردویەتی و لەبەر خاتری لاواز و هەژارەکان".

---

[1] سورەتی (النساء/٧٥).

## کاتێ حکومەتی ئیسلامی نیە تەکلیفی زەکات چیە؟

بۆ وەڵامی ئەمە پێویستە چەند شتێك ڕون بکەینەوە:

ماڵی زەکەوی: یانی ئەو شتەی کە زەکاتی لێ ئەدرێ، نصاب: واتە بڕ و ڕادەی ئەو شتەی ئەبێ زەکاتی لێ بدەین، قورئان هیچ کام لەمانەی باس نەکردووە ، دەستور ئەفەرمێ بە زەکات مەسئولیەت دراوە بە پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم)، لەدوای ئەویش بە شورای ئیسلامی کە لەتەك مەرج و بارودۆخەکانی سەردەمدا بڕ و چۆنیەتی زەکات دیاری بکەن، بەو جۆرە کە لە مێژوی ئیسلامداا حالێمان بووە پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم) دوای ئەوەڵین تەحەولێك کە پێویستە بۆ گەشەسەندنی لایەنی ئابوری  کە ئەو تەحەولەی بە (إخاء) فەرمووە، زەکاتی لە چەند نەوعێ داراییا بە ڕێژەیەك دیاری کردووە، واتە لەلایەنی ماڵیەوە بگەیەتە چەنێ نیسابی، وە لەلایەنی زەکاتەوە چەنێك بسەنرێت، جا نەزەری قوتابخانە فیقهیەکان موختەسەر تەفاوتێکی لەمانەیا هەیە، بەڵام بەهەرحاڵ تا وەختێك ئەوەی وا ئیتاعەتی واجبە لەدوای کیتاب و سوننەت یانی دوای خوا و پێغەمبەر دوبارە دروست نەبێتەوە کە بریتیە لە شورا، وە لەڕێگەی شوراوە بە کۆی ئیجماع ڕێژەیەکی تر دیاری نەکردرێ تەکلیفی موسڵمانان ئەوەیە کە هەر ئەوەی وا دیاری کراوە لەسەری بڕۆن، مەسەلەن حەنەفی مەزهەبە حەنبەلی مەزهەبە شافیعی مەزهەبە مالیکی مەزهەبە پەیڕەوی هەر مەزهەبێکە ئەوە وا لە مەزهەبەکەیا وتراوە لەبارەی ئەموالی زەکەوی و میقداری نیساب و میقداری زەکاتا ڕیعایەتی بکەن ، کەسێك ئەگەر پابەند بوو بەهەر کام

لەم مەزاهیبانەوە وا وتم تەبیعیە حەز ئەکات ئەوە ڕیعایەت بکا ئەمە تەکلیفیَ فیعلی موسڵمانانە، ئەمما ئەگەر ئیجماعیَ بوو ئەمانە تەحدید نیە یەعنی بەیانکردنێکی نیهائی نیە لەتەرەف پێغەمبەرەوە ، دوای ئیخاء ڕوی کردۆتە کۆمەڵگا و ئەو شتانەی بونەتە مایەی دەوڵەمەندی ئەوانە ناونراوە ئەموالیَ زەکەوی لە چ حەدێکدا ئینسان بیەویَ ببێتە دەوڵەمەند ئەوە ناونرایەوە نیساب چەنێك بسەنریَ کافیە بۆ ئەوەی هاوسەنگیەك بەهۆی ئیخائەوە بە وجود هاتووە لەبەین نەچێت، ئەوە ناونراوە میقداری زەکات، هەربۆیە ئەمە جێگیر نەکراوە، تاوەکو ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا کۆمەڵە شتێکی تر بونە ئەموالی زەکەوی ئیزافە بکرێن، هەروەها مومکینە نیساب بگۆڕییَ کە واقیعەنیش ئەگۆڕدرێت، چونکە زۆر کۆمەڵگای دەوڵەمەند و هەژار جیاوازیان هەیە، وە مومکینە میقداری زەکاتیش بگۆڕدرێت و ئەسڵی پێوانەی زەکات قورئان دیاری کردووە و ئەفەرمیَ(العف)﴿وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ[1]﴾ زیادە لە مامناوەندی کۆمەڵگادا بەو جۆرەیە، هەرکەسیَ بە وەسیلەی هەر نەوعە ماڵیَ و سەروەتێك ئەوەنەی هەبیَ کە ئەگەر حسابی چینی مامناوەندی کۆمەڵگا بکەی یانی تەواوی کۆمەڵگا، هەرکەسیَ چەنی بەر ئەکەویَ (داهاتی تاکەکەس) کابرا لەوە زیاتری هەبیَ، مازات لەوە دەبێتە زەکات، دەی ئێستا وەختیَ شورا وجودی نیە، لەو سیَ شتە کە خودا دەستوری داوە ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ[2]﴾ لەتەرەف خواوە کیتاب قورئان،

---

[1] سورەتی (البقرة/٢١٩).

[2] سورەتی (النساء/٥٩).

لەتەرەف پێغەمبەرەوە سوننەت لەتەرەف ئولی ئەمرەوە یان شوراوە ئیجماع، وەختێك ئیجماع وجودی نیە ڕێگەی موسڵمانان هەر ئەوەیە وا هەر زوتر بڕیاری لەبارەوە دراوە، مەگەر موسڵمانێ خۆی ڕوشد و دەرکی ببێ و بزانێ مازادی لەحەدی متەوەسیت بێ خەرجی بکا لەڕێگای جۆراوجۆرەوە بۆ خەیر و مەسڵەحەتی کۆمەڵگا، ئەگەرنا تەکلیفێکی لەسەر نیە مەگەر خۆی بزانێ کە فرەی هەیە هەر ئەو میقدارە زەکاتە بدات بەسە.

ئەگەر وەختێ ئیجماع بوو، شورا تەشکیل بوو، بۆچونێکی دەرکرد ئەوکاتە موسڵمانان بە دەستوری قورئان واجبە ئیتاعەتی ئولی ئەمر بکەن، ئولی ئەمر واتە جەماعەتێك کە خوا ئەفەرمێ ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ[1]﴾ کە لە ڕێگای شوراوە بابەت و کێشەکانی کۆمەڵگا تاووتوێ ئەکەن، ئەکەن، ئولی ئەمر یانی شورا هەروەخت شورای ئیسلامی لە زانا گەلی ئیسلامی لە جیهانی ئیسلامی تەشکیل بوو ئاڵوگۆڕی بیروبۆچونیان کرد، لە مەسەلەیەکدا ڕەئی خۆیانیان ڕاگەیاند، حەقیقەتەن ئاڵوگۆڕی بیروبۆچونی زانایانە و ئاینیانە بوو ئەو بۆچونە واجبە ئیتاعەت بکرێ لەلایەن تەواوی موسڵمانان، تا ئەوە نەبێ تەبعەن هیچ شتێکی تر واجبی ئیتاعە نیە مەگەر وەختێ ئینسان باوەڕ بکا بە بۆچونێك ئەویش بۆ ئەو حوججەتە و مەدرەکە بۆ کەسێکی تر کە باوەڕی پێی نیە مەدرەك نیە، کەسێ شوێنکەوتەی ئەو مەزهەبە کەسێ شوێنکەوتەی ئەو مەزهەبەکەی تر هەرکام دەستور مەزهەبی خۆیان جێبەجێ بکەن، یاخود ئینسان خۆی

---

[1] سورەتی (الشوری/٣٨).

**میقداریٚ لە مەسائیلی کۆمەڵگە بزانیٚ ئەو وەختە ناچارە کە میقداریٚ لە تەکلیفی گەورەتر قبوڵ بکات.**

## کاتێك كۆمەڵگایەك تەوحیدی بێت و چینایەتی تیا نەبێت کێ پارەی هەیە تا بڕوات بۆ حەج؟

لەم بارەوە وا دێتە نەزەرم ئەوەندە شتی بێ سەواد و منالأنە وتراوە ئیتر حەد و حیسابی نیە بۆ نمونە كۆمەڵێ هەر لە بەناو زانایانی دینی وتویانە بێ چینایەتی زاراوەیەکە مارکسیستی، کاریان بە کەلیمەکەیە نە بە واتاکەی و کاریگەریەکەی، یا مەسەلەن زوتر بە کەلیمەی تەوحیدیش کێشەیان بوو لەسەرەتاکانی ئینقلابەوە شورایەك بوو، هەندێ لەمەلاکان بیروبۆچونیان دەربڕیبوو، یەکیان وتبوی خۆشم لە کەلیمەی تەوحید نایەت، تەوحید مارکسیسزمە و عەبا و مێزەرە کراوەتە بەری، خۆی لە بنەڕەتا ئەهلی عەبا و مێزەرە بوو، جا لە بارەی خۆیانەوە وتبوی یان نا نازانم، من بۆ خۆم لە بەحسێکا لە کتێبێك دەربارەی کوردستانا کە ئێستا چاپ بووە باسمان کردووە و ئەمەمان ڕون کردۆتەوە، ئیتر کەسێکی ڕاگەیاندکار بێت و بڵێ ئەها چووە بەرەو بیری مارکسیستی، تەواو بێ خەبەرە لەبەکارهێنان و مانای ئەو وشە لەلای ئێمە و بیری مارکسیستی، چەند جار باسمان کردووە و دوبارەمان کردۆتەوە كۆمەڵگایەك كۆمەڵگایە ئیستکباری تیا نەبێت و ئیسرافی تیا نەبێ، ئەوەی مارکسیست ئەیڵێ لەم بارەوە و بەم زاراوە بێ چینایەتیە، لەبناغە و سەرەتاوە درۆیە، چونکە ئەو بۆچونە ئەو هەیەتی كۆمەڵگا بێ چینایەتی ناکاتەوە، بەڵکو كۆمەڵگا چینایەتی ئەکاتەوە و چوار مێخ دایئەکوتێ کە ئیمکانی نیە چینەکان تەکان بخوات، تازە لە دەسەڵاتی سەرمایەداریا ئەگەر ئیمکانی دەساودەسکردنی کار و پلە هەبێ، واتە کارگەر ببێتە کارخانەدار و

کارخانەدار ئیفلاس بکات، لە ولآتی مارکسیستیا ئەم ئیمکانیشە نیە، حکومەت سەرمایەدارە و کارگەری بێچارە حەماڵ، کۆمەڵگەی پڕچینایەتی و پڕ چینایەتیترین کۆمەڵگەی مارکسیستیە، ئەشێ کەسێ چەند بێ ئاگا بێ، بڵێ مارکسیست چینایەتی لەناو ئەبات، ئەمە ئەوەڵین ئیراد، دووەم مەگەر ئێمە سەروکارمان لەتەك زاراوەیایە یان مانا و واقیعیەت؟!

بەو جۆرە کە وتم لەبارەی مارەییەوە، تۆ ئەوە کە مەوازینی شەرعی هەیە ئەنجامی بدە ئیتر هەر ناوێکی ئەنێیت گرنگ نیە، چونکە ناو و کەلیمە گرنگ نیە، یەکێ مارەیی پێ ئەڵێ یەکێ شیربایی، یەکێ لاشیری پێ ئەڵێ کەیفی خۆیەتی، مەتڵەبەکە دروستە. پێویستە کە کۆمەڵگای ئیسلامی دوو ئافەتی تیا نەبێ، سەرەتا ئافەتی مەعنەوی و پاشان ئافەتی ماددی، ئافەتی مەعنەوی ئیستکبارە، ئافەتی ماددی ئیسرافە، دەی جا بیری لێ بکەنەوە ، کۆمەڵگایەك ئیستکباری تیا نەمێنێ، یانی بەعزێ خۆیان لەکۆمەڵێکی تر گەورەتر نەبینن، گشتی خوشك و برا بن لەبەرامبەر خواوە بێ هیچ پلە و گەورە و بچوکیەك ، پاشان ئیسرافی تیا نەبێ، کۆمەڵێ خۆشتریان نەبێ لە کۆمەڵێکی تر، ئایا چینایەتی بونی هەیە لە کۆمەڵگایەکی وادا؟!، جا لەوەودوا هەر شارێك ناوێکی چینایەتی بۆ دروست بکە، گرنگ ئەوەیە ئەو (ماصدق) ئیسلام گەرەکیەتی ئەوە، واقیعەن بێ چینایەتیە، تەنها و تەنها ئەوەی لە نیزامی ئیسلامیا هەیە کە مەفهومی چینایەتی نەمێنێ مەفهومی (ماصدقت)ە، بەجۆرێکە ئەو کەلیمەیە لەبەین ئەبات، وە لە هەر کۆمەڵگایەکی تری غەیر کۆمەڵگای ئیسلامی، چینایەتی بونی هەیە، تەنها ئیسلامە چینایەتی لە بەین

ئەبات، بەڵام مارکسیست چینایەتی مەحکەم ئەکاتەوە و گوڵ و مێخی پیا ئەکوتێ بۆ ئەوەی تەکان نەخوا، کەچی کەسێ بەناوی زانای دینەوە و پێی بڵێن مەلا بێت و بڵێ تەوحیدی فیکرەیەکی مارکسیستیە و ئەسڵی چینایەتیە!

بەهەرحاڵ دوای ئەم ڕونکردنەوە، دەچینەوە سەر ئەو پرسیارەی وا لەسەرەتاوە وتمان، عەرز بێت لە بارەی حەجەوە، مەکتەبی فیقهی غالبەن دوو شت ئەڵێن بۆ شەرتی پەیوەستی ﴿مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا[1]﴾ یەکێکیان پابەندی ماڵیە، دووەمیشیان پابەندی بەدەنیە، هەڵبەتە بەعزێك لە بۆچونی فیقهی هەیە تەفاوت قائیلن لەتەك ئەم پابەندیانەوە، بەڵام واقیعیەتێك بگرینە نەزەر، واقیعیەت ئەمەیە کە لە مەسەلەی حەجدا پابەندیە ماڵیەکە هیچ ئەرزش و بایەخێکی نیە، شتێك فرە فرە موهیم و ئەساسی بێت پابەندی بەدەنیە، مەسەلەن کەسێك هەیە نزیکەو کەسێك هەیە دوورە واتە لەلایەنی خەرجیەوە ئەمانە فەرقی هەیە، کەسێك بە فڕۆکە ئەچێ یان بەپاس، کەسێ بەکرێی ماشین ئەچێ، ئەو کاروانچیانە بۆ ئەم ساڵ هەرکەسێ ٢٠هەزار تمەنیان سەندووە بۆ هەرکەسێ کە قەزای حەجی کردووە، لەحاڵێکدا ئەوانە وا بەماشین ئەچن، من ساڵی پار ئەمبیست کە نزیکەی ٧٠٠ تا ٨٠٠سەد خەرجی هاتوچۆکەیانە، یاخود هەبون چادریان بەکۆڵیاندا ئەدا، یان هەن بەشێوازی خانەوادەیی دێن، کەسیش هەیە هیچی لەمانە ناوێ، کەسێ مەیلی بوێ بە کارکردن و کاری بەدەنی ئەڕوات، فەرز فەرموو توانایی کرێکاری هەیە، ئەڕوا سێ چوار

---

[1] سورەتی (آل عمران/ ٩٧).

ڕۆژ، کار ئەکا یان بە پیادە وەك گوزەشتە کە ئەم وەسائیلی گواستنەوەیە نەبوو ، دوو ڕۆژ سێ ڕۆژ لە شارێکا لائەدا کرێکاری ئەکا و پارە دەردێنێ، ئەو پارەشی بەشی سێ چوار ڕۆژی ئەکا، لەدونیای ئەمڕۆشدا فەرز بکە کەسێ ماشینی هەیە و بەماشینەکەی خۆی ئەچێ بۆ حەج لەڕێگا تەکسی پێ ئەکا و کرێ وەرئەگرێ و خەرجیەکەی خۆی پێ دەردێنێ،، هەربۆیە مەسەلەی ماڵی مەسەلەی عومدە نیە لەحەجا، پابەندی پابەندی بەدەنیە، هەڵبەتە پابەندیە بەدەنیەکەش هێشتا نیسبەت بە ئیخلاس و دڵپاکی بچوکە، وەلی لەبارەی پابەندی مادیەوە بڵێین پابەندیەکە بەدەنیە نە ماڵی ، دواتر ئەگەر تەسەوەر بکەی کە کۆمەڵگایەك بووە کۆمەڵگای تەوحیدی چۆن مەردم زیاد و کەمیان هەیە تا ژمارەیەك بچن بۆ حەج و ژمارەیەك نەچن، لە ئەساسدا لەبەر زیادی ئەم دوو مەتڵەبە ماڵی و بەدەنیەیە، مەسەلەی ماڵی موهیم نیە و لایەنی بەدەنی موهیممە، ئەمما نوکتەیەکی تر بڵێین ئەوەی کە دەڵێین کۆمەڵگایەك دەبێ بێ چینایەتی و تەوحیدی لەوە تێگەیشتون و مانای ئەوە نیە کە هەمیشە و بۆ هەرچی کەسە نیسبەتی زیندەگی ماڵی سەد دەر سەد بۆتە یەك، ئەمە ئیشتباهە ئەمە هەڵەیە، خۆ کۆمەڵگای بێ چینایەتی و تەوحیدی مانای زیندەگی کوفنی بێت، کە هەرچی شتە لەڕێگەی کوفنەوە پێی بدرێ مەسەلە ئەوە نیە ئا ئەو تەسەورە نا تەنزیمێك دەکرێ لەدەرامەتا لە زیادی کارگەرا، لەوەودوا هەڵبەتە خوب لەبەرا تەکانێ ئیفتسادی شەبیهە بە ئیقتصاد ئیخاء ئیجرا ئەکریێ، تەحەولێك بە وجود بێ بان و خوار لەبەین بوا، وەکو ئیخائێك پێغەمبەر لە ئەوەڵین کۆمەڵگەی ئیسلامیا ئیعلانی

فەرمووە، هەر وەخت بتەوێ کۆمەڵگە ببێتە ئیسلامی ئەشێ لەبەرا کاری وا بکەی ئەو پەیوەندیە بشکێنی و بیهێنیتەوە سەر ڕاستەکەی، جا لەوەودوا هەوڵ ئەدرێ دەرامەتەکان وەکو یەك بێت و هەوڵ ئەدرێ بەوەسیلەی زەکات تەنزیم بکرێ لەگەڵ تەفاوت، بەڵام هەرگیز ئیمکانی نیە وەکو یەك بن، فەرز فەرمووە ئەمشەو فلانە ماڵ خۆراکێك پڕ خەرج ئەخوا ئەو ماڵەکەی تر کەم خەرج، کاتێ تەماشایان ئەکەی کەمێ فەرقیان هەیە ئەمشەو ئەو ماڵە جەماعەتێ میوانی دێ ئەوەکەی تر میوانی نایێ، یەکێ ئەچێ بۆ گەردش و سەحرا و سەفرەیەك حەرجی زیاترە لەوەی لەماڵی خۆیایە لەماڵا کەمتر خەرج ئەکا، ئا ئەم جۆرە مەتاڵبە هەمیشە لە کۆمەڵگایا هەیە، ئافەتەکان و گرفتار گەلی جۆراو جۆر بەوجود دێن لەوەی حکومەت قەرەبوی بکاتەوە، بەڵام ئەم بۆچونەی پێی وایە کۆمەڵگە ببێتە چینایەتی تەوحیدی چونکە کە وتت تەوحیدی واتە بێ چینایەتی، نە چینایەتی ماڵی نە بەدەنی هیچ کامێکیان نامێنێ لە کۆمەڵگەی ئیسلامیا، چونکە چینایەتی مەعنەوی کوشندەترە، چینایەتی ماڵی شتێکی عەجایب نیە، چونکە کەسێك کەمێك دەرك و فەهمی ببێت ئەزانێ کە لەبواری مەعنەویا تەفاوت و ئیمتیازات لە مەعنەویا چەنێك مەترسیدارترە، چۆن ئینسان حازرە تەواو سەروەت و سامانی فیدا بکات بۆ لابردنی زوڵمی مەعنەوی بەڵام ئێستە تەوزیحی ئەوە نادەین، ئەگەر کرا تەوحیدی کە هیچ کات بان و خوارێ دروست نابێ، بەڵام کۆمەڵە بەرنامەیەك هەیە لەهەموو کۆمەڵگایەکدا، بەنمونە عینوانی میسال لەناو بەحسەکا کەسێ حەفتەیەك ئەچێ بۆ سەفەر یەکێ لەو بەرنامانەی ئەوە بێ، کەسێ بەرنامەی حەج دائەنێ، پاشەکەوت ئەکا

بۆ خۆی و ورده ورده له خەرجیەکانی ڕۆژانەی ئەگەڕێنێتەوە تا چکە چکە ئەوەندەی بۆ کۆبێتەوە بچێ پێی بۆ حەج، کەسێکی تر نایکات، پاشان  کە وای لێهات گشت پابەندی پەیدا ئەکەن، ئەمما ڕەغبەت گەلی ڕۆحی وەك یەك نیە کە گشتی لە سالێکا بچێ، پابەندی بەدەنی وەك یەك نیە، سەرقالیەکان وەك یەك نیە، هەروەها لەلایەنی مالیەوە بتوانن بەلاّم دەبینی بەشێك ئەڕۆن و بەشێك ناڕۆن، ئەو وەختە هەرچەند ئیخلاسیش بێ، هەرچەند گفت و پەیمان و تەقواش بێ وانابێ کە گشت بەجارێکا لە گۆی زەوییەوە بڕۆن بۆ حەج، شتێکی نامومکین و نەگونجاوە، هەروەها هەیە دەولەمەندە زۆر خەرج دەکات، ئەهلی زیادەڕۆیی و ئەمانەیە ئای چ خەرج گەلێکیش ئەکات ئەکرێ موجازاتیش بکرێ لەسەر خەرجیەکانی هێشتا ناڕوا بۆ حەج!

## ئایا لە حەجدا دەستنوێژ بەتاڵ ئەبێتەوە لە بەریەککەوتنی ژن و پیاو یان نا؟!

ئێمە وەکو شافیعی مەزهەب بەڵێ زوتر بەحسێکمان بوو لەبارەی تەقلیدەوە کە وتمان زەرورەت گەلێك ئەبێتە هۆی ئەوەی کە ئینسان لە مەسەلەیەکا تەقلیدی مەزهەبێك غەیر ئەو مەزهەبەی خۆیە بکات، ئەوەشمان ڕونکردەوە کە لە ڕوی عیلمەوە شی بکاتەوە بە بەڵگەوە و بزانێ کامە زەعیف و کامە بەهێزە، ئەگەرنا هیچ وەختێ بۆ خۆی تەبەعیەت نەکات بەبێ ڕونکردنەوە، هەرچەندە ئەبێ ئاگاداری ئەوە بێت لە فەتوا بۆ غەیر وەلی بۆ کەسێ کە ئەهلی تەقلیدە لە وەختی زەرورەتا دێت تەبەعیەت ئەکا لە غەیر، بۆ نمونە لەزۆرێك لە مەسەلەکاندا کە مەزهەبێك لە مەزهەبەکانی قبوڵ کراوی ئێمە کە ڕێگەیان یەکێکە، گشت لە ڕێگەی سوننەتی دەورانی پێغەمبەرەوە و خولەفای ڕاشیدینەوە مەسائیلەکانیان شیکردۆتەوە کە پێیان ئەڵێن مەزهەبی ئەهلی سوننەت، ئەم یەکە کە شتێك ئەڵێ لە فلاٌنە بابەتدا ئەوی دیکە شتێکی تر، موقەلید لەبەر خاتر زەرورەت لە فلاٌنە مەتلەبا تەقلید لەو ئەکا، یا موفتی لەبەر خاتر زەرورەت، لەبەر خاتر فەراغ لە ئسوڵ و حەرەج کە موقتەزای دین ئاسانبونی کاری مەردمە، ئەزانێ ئەگەر بەو مەزهەبە موتتەبەعە فەتوا بدات ئەو ئاسانیە وا دین گەرەکیە نەك ئاسانیەك خۆی بیەوێ، چونکە ئاسانیش دوو جۆرە، ئاسانیەك هەیە دین گەرەکیە پەسەندیدەیە، ئاسانیەك بۆ خۆشی و هەوەسە ئەوە ناپەسەندیدەیە، بۆ

ئەوەی ئاسانی دینی لەبەین نەچێ وەزیفەی ئەوەیە فەتوا بدات بۆ ئەو مەزهەبەکەی تر، هەروا کەسێك تەقلید دەکا لە مەزهەبێکی تر.

## کۆمەڵێ لە موسڵمانان لە مزگەوتێکدا بن دژایەتیان لەگەڵ ئیمامەکەدا ببێ، ئایا جائیزە پابەند نەبن و سەفیان جیا بکەنەوە یان نا؟

لەم بارەوە بەحسێکی موفەسەڵمان کرد، وتمان وەختێ ئیمام بە مەرجەکانی ئیسلامیەوە وجودی نەبوو ئیمامی ڕاتب، ئەو وەختە ئینسانێ کە ئیمامەت ئەکەن ئەبنە سێ دەستە، ئەگەر ئەوەی وا مەتلۆبە نەبێ، هەرکام لەو سێ دەستەشمان ڕونکردۆتەوەو وتومانە ئەوانەی وا پەیوەستیان بە دینی ئیسلامەوە هەیە و خۆی واقیعەن موسڵمان بێ نەك هەر دەم مەلاَ ئەهلی هوشە و هەرا و بەزم، چونکە داخەکەم زۆرمان هەن لە موسڵمانان لە ئەخلاق و تەعامولی خۆیانا شتێکیان تیا بەسەر نیە بەلاَم ماشەڵلاَ هەرا و بەزم ئەکەن و تەپوتۆز ئەکەن، موسڵمانی واقیعی فیعلەن ئەبێ پابەندیان هەبێت و زۆر لەوە موسڵمان تر بن وا ئەیلێن، چونکە خۆ هەڵکێشان و تەبلیغات کردن و هەراو بەزم کردن نابێتە دەلیلی موسڵمانی، هەڵبەتە یەکێ لە تەکالیفی ئەوەی ئینسان عبودی بوو هەر ئەندازەیەك لەبارەی ئیسلامەوە زانی بیلێ، هەڵبەت بەشێواز و تێگەیشتنی خۆی و بەرێگەی دروستی ئیسلامی، بەلاَم داخەکەم هەندێك هەن لەموسڵمانان تەنهاو تەنها هەراو بەزمەکە فێر بون، ڕەخنە لەمەردم بگرن و ئەو ئەوەی خراپە و ئەوەی ناپەسەندە و .... ئەمە نیە نەوەلاَ، موسڵمانێ کە پەیمانی بەست و تەسلیم بە ئیسلام بوو، تەکلیفی شەرعەن مەعلومە نیسبەت بەو سێ ئیمامە کە پێشتر وتومانە.

# تەیەموم چیە؟ چۆن و کەی دەکرێت؟

تەیەموم مەتڵەبێکە فرە سادە لە وەختێکا ئاو نەبێ بۆ دەستنوێژ یاخود بۆ ووسڵ فەرق ناکات، واتە بۆ ڕوداوێکی بچوك بێ یان گەورە، ئاوی دەست ناکەوێ تا دەستنوێژ بشۆرێ، ئاوی دەست ناکەوێ تا ووسڵ بکات، یان نەخۆشە و موشکلاتێکی هەیە، ئاو هەیە بەلاّم پێی ناکرێ و مەقبوڵ نیە بۆی، یا مەقبوڵ نیە ووسڵ بکا یا دەستنوێژ بشۆرێ، یان ئاوەکە بۆ شت گەلێ گرنگتر لازم تر هەیە و مەردم تونیانە ئاو بخۆنەوە ئەگەر ئەم دەستنوێژ ئەشۆرێ مەردم تونیان ئەبێ و ئەکەونە فشار بۆ شت شتن لازمە، ئا لەم کاتەدا دەستوری دین و دەقی قورئان ئەمەیە کە ئینسان تەیەموم بکات، تەیەمومیش شتێکە فرە فرە سادە، چەند شێوازێکی جیاوازی هەیە بەلاّم سادەکەی ئەڵێم، ئاوا تەختی هەردوو دەستی ئەداتە مل ئەو شتە ئەگەر هەبێ خاکێکی پاکوخاوێن، ئاوا ئەیتەکێنێ و دیار نەبێ تۆزەکەی، چونکە پێشتر باسمان کردووە، ئەمە بۆ تەمینێ نیازێ ڕۆحیە کە لە دەستنوێژ و تەیەموما هەیەو شێوازە زاهیریەکەیان فەرق ئەکات، ئەیهێنێ بە دەموچاویا ، لەوە و دوا مەیلی بوو دەستی چەپی ئەداتە مل خاکا، سەرپەنجانی ئەهێنێ بە پشت دەستیا، ناوکەفی دێنێتە ئەودیوا، مەیلی بێ جارێکی تر ئەداتەوە بەمل خاکەکەیا، ئەو دەستەکەی تریش هەروا، یان سادەتر یەك جار هەردوو دەستی ئەدا بە مل خاکا نوکی ژێر پەنجەی، یانی ژێر دەستی چەپی دێنێ لە بان پشت پەنجەی ئەیبات و ئەیهێنێتەوە تا لای ئانیشك، لەولاوە دەستی چەپی دێنێ لە ژێرەوە لەژێر ئانیشك و باڵیەوە دێنێتەوە تا ناو دەستی، ئەم دەستەکەشی

هەر بەو جۆرە تا بەو جۆرە تەواوی ئەکات، ئا بەم جۆرە تەیەمومەکەی کاملٚ بووە، ئەمە شێوازی سادەی تەیەمومە، ئەو شتە وا تەیەمومی پیٚ ئەکریٚ موفتەزای ئەو شتەی وا قورئان ئەفەرمیٚ  شتیٚ کە دلنٚیا بیت و گومانت نەبیٚ ئەگەر بتەویٚ خاکی پاکوخاوێن دیاری بکە، خاکی پاك نەبوو فەرزکە فەرشیٚ پاك کە تۆزی ببیٚ، نیە و پەیا نابیٚ ئەویش گۆشەیەك یان لیباسەکەی خۆی، یان لەشوێناکایە بارانە و تەڕو توشی هیچیٚ نیە، ئەوەتای لەناو بەفرا هیچت دەس ناکەویٚ، یا ئەوەتای لە کەژ و کوێکەوە، دەست بدە لە لیباسە تەڕەکەی خۆتدا، ئەوە وا مەتلۆبە لە تەیەموما خاکی نوێژیە، ئەگەر نەبوو هەرشتێکی تر بە حکومی زەرورەت بەکاربێنی کە شوێن ئەو بگرێتەوە، ئاخیر شتەکەی ئەوەیە فەقەت شێوازەکە جێبەجیٚ ببیٚ، ئەگەر دەست بێنی بە ئەژنۆی خۆتا یان مل سینەی خۆتا یا هەر شوێنیٚ کە جێگەی ئەو عەمەلە بگریٚ پاك بیٚ، ئەگەر شتیٚ وشك نەبیٚ و تۆزیشی نەبیٚ هەر دروستە.

# قەسر و جەمع

لە سوننەتی عەمەلی و قەولی پێغەمبەردا (صلی الله علیە والە وسلم)ڕیوایەت کراوە وەکو مەسەلەیەکی گرنگ لەسەفەردا، جا لە مەزهەبی ئێمەیا کە شافیعی مەزهەبین هەردوکی وەك یەك سوننەتە جا لە بەعزێ لە مەزهەبەکاندا فەرقی هەیە، لەبارەی سوننەتی قەسر و جەمعەوە، هەروەها لەبارەی دووریەکەیەوە ئێمە ئەڵێین ٩٦کم، یانی دووری ئەو شوێنەی سەفەری بۆ دەکات، سەفەرەکەش شەرعی بێت یانی موباح بێت، کابرا نەچێ بۆ دزی و تەڵەکە و درۆ و دەلەسە و وا نەبێ، واقیعەن سەفەرێ بێت خوا پێی ناڕازی نەبێت، مەتلۆب بێت لەدین، ئەگەر وا بوو ڕەوشی عەمەلی پێغەمبەر(صلی الله علیە والە وسلم)و هاوەڵانی ئەمە بووە کە هەم قەسریان کردووە هەم جەمع، چونکە دوو دانە شتی جیان لەیەك.

جەمع ئەمەیە دوو دانە نوێژ نیوەرۆ و عەسر بەیەکەوە بخوێنی، فەرز بفەرموو لەکاتی نیوەڕۆدا نوێژ نیوەڕۆ بخوێنی و سەلام بدەیتەوە و بەشوێنیدا نوێژی عەسر بکەی، ئەمە جەمع کراوە، نوێژ نیوەڕۆ و عەسر بەیەکەوە، ئەمەی دووەمەکە هاتۆتە لای یەکەمەکە جەمع تەقدیرە، یا بەپێچەوانەوە وەختی نیوەڕۆ بڕیار بدەی نەك غەفڵەت بگری و ئیقتیدا نەکەی تەسمیم بگری نوێژی نیوەرۆ ببەیتە لای نوێژی عەسر، وەختێ عەسر هاتە پێشەوە، لەسەرەتاوە نوێژی نیوەڕۆ ئەخوێنی چونکە نوێژی یەکەم هەر لە سەرەتاوە ئەخوێنرێ، پاش ئەوەی نوێژی نیوەڕۆکە ئەخوێنی و سەلام ئەدەیتەوە نوێژی عەسریش ئەخوێنی، بۆ مەغریب و

عیشاش بەهەمان ئەو جۆرە عیشا بێنیتە لای مەغریب یا مەغریب بەریتە لای عیشا هەر ئەبێت.

قەسریش عیبارەتە لەمە کە چوار ڕکاتیەکان دوو ڕکات بخوێنی، نیوەڕۆ دوان، عەسر دوان، عیشا دوان، ئەشتوانی قەسریش و جەمعیش پێکەوە بخوێنی، دوو ڕکات نوێژ نیوەڕۆ بخوێنی سەلامت داوە بێ فاصیلە دوو ڕکات نوێژی عەسریش بکەی، یا نوێژ نیوەڕۆ ئەبەی بۆ لای عەسر، لە عەسرا ئەم کارە بکەی، لەسەرەتاوە دوو ڕکات نوێژ نیوەڕۆ پاشان دوو ڕکات نوێژی عەسر، مەغریب قەسری نیە تەبعەن سێ ڕکات مەغریب ئەخوێنی بە شوێنیا دوو ڕکات عیشا، ئەمە سوننەتە و هەر کەس ڕیعایەتی بکات ئەگەر دووریەکە بەو جۆرە بوو کارێکی باشی کردووە، کارێکی کردووە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم)و هاوەڵاْن ئەنجامیان داوە، جا لەبارەی سوننەتەوە کە هەر مانای موستەحەب و مەندوب و نەدب و ئیستحباب و ئەمانەیە ئەوە بەحس گەلێك هەیە بەلاْم ئەمەی کە من لێرە ئەیلێم سوننەت مەبەستم سوننەتێك نیە کە دەرەجەیەك خوار واجبە نا مەبەستم ڕەوشە، لە ڕەوشی پێغەمبەر و هاوەڵاْندا بووە هەربۆیە پەسەندیدەیەو لەوە و دواش کە لە سوننەتی قەولیشدا ڕیوایەت کراوە، کاتێ بە پێغەمبەریان(صلی الله علیه واله وسلم) فەرمووە کە فلاْنە کەس جەمعی نەکردووە یا قەسری نەکردووە فەرمویەتی کارێکی خراپی کردووە، ، خوا وای فەرمووە، وا باشە قەسر و جەمع بکردرێ، هەربۆیە پێویستە ئێمە ئەنجامی بدەین، نەك ئەوەی کە وەك عادەتمان کردووە وەختی خۆی بە ئیفراد و بە ئیکمال، ئیفراد مقابڵی جەمعە، ئیکمال مقابڵی قەسرە، بڵێین وەڵاْ ئیتر من عادەتم

کردووە هەروا ئەیخوێنم، ئەوە هیچ نیە، ئەوە نوێژی وەك عادەتە، نوێژیَ خواناسی نیە ، وە ئیلا وەختیَ نوێژ بۆ خواناسیە، ئالەم لەحزەیا خوا دەستور ئەفەرمیَ نوێژەکەت مەخوێنە، بەسەرچاو ئیتاعەت نایخوێنم، چ پەیوەندی بەمنەوە هەیە، مەگەر قەرارە من خۆم بۆ خۆم دین دروست بکەم؟! ئەگەر بەندەیەکم تێگەیشتوو، خواناسێکی دروست، چی خوا فەرموی ئەوە لەوەیا خێر و مەسڵەحەتم هەیە، بۆ نمونە لەوەختێکا خەریکی نوێژ ئەخوێنی ئەبینی کەسێك لەبانێکەوە ئەکەوێتە خوارەوە یا شتێکی بۆ پێش دێت، ئەگەر توانیت هەردوو تەکلیفەکە پێکەوە ئەنجام بدەی ئەوە زۆر باشە، ئەگەر نا واجبە نوێژەکەت ببڕی و کابرا لە مەترسی ڕزگار بکەی، ئەمە دەستوری خوایە، بەسەرچاو، دەستور ئەمەیە نوێژەکەم ببڕم لەبەر خاتری خەڵك، لەبەر نەجاتی ئینسانێك ئیتاعەت ئەکەم یا بڵیَ نەوەڵاَ من نوێژ خۆم چۆن بەتاڵ ئەکەمەوە ئەمە کەی موسڵمانیە، موسڵمانی ڕاستەقینە ئەبیَ لەڕوی فەهم و شعورەوە بێت، هەوەس نەبیَ، خۆم نەکەمە خوا و قانون دابنێم بۆ خۆم مەگەر ئینسان چیە تا بەرنامە دانیَ بۆ خۆی بە چ فەهم و شعورێکی؟! نەك خۆم تەواو بەشەریەت، تەواو بەشەریەت چی تێگەیشتووە لەم دونیایە کە بیَ حەقی ئەوەی بیَ بەرنامە بۆ من دانیَ؟! ئەو خوا ئەم جیهانەی دروست کردووە، ئەوەنەی ئیحترامی هەیە لەهزرمدا قانون بۆ من دانیَ و منیش بە گیان و دڵ ئیتاعەتی بکەم و سوجدەی بۆ دانێم، غەیری خوا هیچ شتێکی تر قابیلیەتی ئەوەی نیە، وەختیَ فەهم و شعورێکی بەو جۆرە بوو لە هەر وەختێکا خوا هەر دەستورێکیدا بە ئیفتخاری ئەزانم و لەزەت ئەبەم کە

بەندەگی بکەم ئیتر ناکەومە هەواو هەوەسی خۆم، ناکەومە شوێن عادەت و بڵێم چونکە وام عادەت کردووە، وا ئەکەم ئیتر عادەتەکەم ناگۆڕم، ئەو موسڵمانێتیە هیچ نیە و بەکەڵك هیچ نایەت، خوا تەوفیق گشتمان بدات موسڵمانیەکەمان ئاوا عاقڵانە بێت لەڕوی فەهم و شعورەوە بێت و سەرپێیانە نەبێت.

# وەسیەت

ئەگەر کەسێك لە ژیانی خۆیدا کەسێکی خێرخواز نەبێتو ڕژد بێتو دڵی نەیەت کاری خێر ئەنجام بدات، بەڵام لە کاتی ئاسایش یان لە سەرەمەرگدا وەسیەت بکاتو بڵێت دوای مردنم ئەوەندە لە ماڵو سامانم بکەنە خێر بۆم، ئایا خێرو پاداشتی هەیە؟ ئەم کارە بکرێت یان نەکرێت باشە؟

لێرەدا مەبەستەکە دوانە:

یەکەم. ئایا پاداشتی هەیە یان نا؟! ئەمە پەیوەندی بە ئێمەوە نیە، سزاو پاداشت پەیوەندی نێوان بەندەو خالقەکەیەتی، تەنها خوای گەورە بۆ خۆی دەزانێت ئەو کەسە چ نیەتو ئەرزشێکی هەیە، ئایا شایانی پاداشتە یان نا؟!

بە ڕوکەش ئەوەیە کە ئێمە لێی تێگەیشتوین، کەسێك کە ئەهلی خێر نیەو وەسیەت بەو جۆرە دەکات، وەسیەتەکەی هیچ خێرو پاداشتێکی نەبێت! چونکە کارەکەی تا وەختێ لە ئیختیاری خۆیدایەو ئەتوانێ سوودی لێ ببینێت لە لایەنی خێرو بەختەوەری خۆیو خەڵکی دڵی نایە بیکات، بەڵام بیرئەکاتەوە دوای مردن هەرچی ئەبێت با ببێت، لێرەشدا هەر نیەتەکەی حسابە، بۆ نمونە ئێستا دڵی نایە لە ماڵی خۆی خێر بکات، بەڵام حەز بەوە دەکاتو دەیەوێ زیان لە وەرەسەکە بدات، ئەگەر نیەتەکە وابێت لە بنەڕەتدا پاداشتی بۆ نیە، بەڵام ئەوە ئێمە نین شیکاری بۆ

بدەین ئێمە بە ئەگەرەوە قسە دەكەین، ناتوانین بڵێین فلانە كەس بەو جۆرەیەو ئەوی تر بەم جۆرە.

ئێمە ئەوەندە دەتوانین بڵێین ئەگەر نیەتی كەسەكە خێربێت كردارەكەی پاداشتی هەیە وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) دەفەرمویێت"إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل امرئ ما نوي"[١] بەو جۆرەی قورئان باسی بابەتی بەخشینی كردووە، كاتێ كەسێ لە نیەتیدا گەندەڵەو لە ڕووكەشدا گەورەترینو ملیۆنان لە سامانی خۆی بۆ كاری زۆر خێرو ئەرزشدار دەبەخشێت، لەگەڵ ئەوەی كەمترین پاداشتی نیەو ئاگریان بەرداوەتە ماڵو سامانی خۆیان، لە دوا ڕۆژیشدا لە جیاتی خێرو پاداشت سزا وەردەگرێت، بەهۆی ڕیاو شركو لەبەر نیەتی نادروستو مەبەستیان شتێكو ڕواڵەتیان شتێكی ترە، بەكردارو ڕواڵەت جۆرێكن، بەلام بە مەبەست جۆرێكی تر. ئێمە یاساكە دەزانین بەلام تاك لەم یاسایەدا چ شتێك شمولی دەكاتو ناكات ئەوە پەیوەندی بە ئێمەوە نیە تەنها پەیوەندی بە خوای گەورەوە هەیە.

بێینەوە سەرباری جێبەجێ كردن، بەڵێ دەبێت جێبەجێ بكرێت، ئەو كەسەی وەسیەتەكەی كردووە كەیفی خۆیەتی چ نیەتێكی هەیەو هەبووە، پاداشت وەرئەگرێ یان سزا، ئەوە پەیوەندی بە ئێمەوە نییە! چونكە لە دیندا ئیجازە دراوە لە ڕێی وەسیەتەوە ماڵی ئینسان بگەڕێتەوە بۆ ئەفرادی كۆمەڵگە یان بۆ بەرژەوەندی گشتی كۆمەڵگە، ئەم مەتڵەبە جێبەجێ بكرێت، جیایە لەو مەتڵەبە كە ئایا ئەو پیاوە پاداشتی هەیە یان

---

[١] رواه البخاري ومسلم في صحيحهما

نییەتی، ئێمە کارمان بەوە نیە، ئەوە لە نێوان خۆیو خوای خۆیدایە، بەڵام بارەکەی تر پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە، ڕێگەیەکی مەشروعی و بەڕواڵەت دەست کەوتووە بۆ ئەوەی میقدارێ ماڵی کەسێك بگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی تر یان بکرێتە سەروکارێکی بەسوود بۆ کۆمەڵگە، ئەوە بەرپرسین و پێویستە جێبەجێی بکەین، مۆڵەتی ئەوەمان نییە خۆمانی لێ لابدەین، ئیتر کەیفی خۆیەتی کابرا لەبەرامبەر ئەوە کە ماڵەکەی جارانی کە ئێستە هی ئەو نییە، ئایا پاداشتی هەیە یان نا ئەوە حسابی خۆی هەیە.

ئەمما یەکێك لە شێوەکانی وەسیەت، کە وەسیەت بۆ وارس دەکەن یا وەقف بۆ منالّی کوڕ دەکەن ، لە ڕاستیدا ئەمە هەر وەسیەتە، ناوی نراوە وەقف، واتە ئەو کەسە دەیەوێ دوای ژیانی خۆی ئەم کارە بکرێت، ئەو جۆرە وەسیەتە:

یەکەم: مەنصوصە "لا وصیة لوارث[1]" فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله علیه واله وسلم).

دووەم: بەڕاستی ناپەسەندە و دەخلو تەصەروفە لە کاری دیندا، قانونی دین گۆڕاندنە بەو جۆرەی کە پێی دەوترێ حیلەی شەرعی، پیسترین تەرتیبە، حیلەی شەرعی واتە لە دیندا فرتوفێڵ بکەیت بۆ ئەوەی ئامانجی دین بگۆڕی، حیلەی شەرعی زاراوەیەکە مانای پرۆژەیەکی هەیە کە دروست خیلافی ئەوەیە، مانای مەشروعەکە ئەوەیە ئینسان خەریکە دوچاری مەحزورێك دەبێت هەوڵ دەدات هەرچی زیاتر ئەم مەحزورە

---

[1] صحيح البخاري - بَاب لَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ٢٥٩٦

چارەی نییەو بەسەریا دێت حاڵەتی پەسەندیدە  پەیدا بکات لەم شێوانەی ناویان نراوە حیلەی شەرعی ڕواڵەتی پەسەندیدە ئەکێشێ بەسەر ماهیەتی ناشەرعیو ناپەسەندا.

ئەمە شێوەی گۆڕینی حوکمی خوای هەیە، شێوەی ئەوەی هەیە ئینسان لە ژێر قانونی خوادا دەرچێو بڵێ من نامەوێو بیگۆڕێ بە بارێکی تردا، ئەوەی ئیشارەتم بۆ کرد هەرچەند ناوی دەنرێت وەقف هەر وەسیەتە، ئەحکامی ئیسلامی ماهیەتێکیان هەیە، سیفاتێکیان هەیە، تایبەتمەندیەکیان هەیە دەبێت بەوە ئاڕاستە بکرێت ئەگەر لەفزو کەلیمە هەرچیەك بێت ئەرزشی هەر مەوزوعێك بە ئیعتباری ئەو ماهیەتە شەرعیەیە کە هەیەتی، وەختێ ئینسان دەیەوێ تەصەروف بەو ماڵەی هەیەتی دوای مەرگ بکات لەژێر هەر ناوێکدا بێت، ناوی نەزری لێ دەنێت یان بەیع یان وەسیەت یاخود وەقف، هەرناوێکی بنێت، ئەوە حوکمی وەسیەتی هەیە.

وەسیەت بۆ وەرەسە واتا تەوریس یەعنی ئەم ماڵی خۆی بەش دەکات لە نێوان وەرەسا، پەیوەندی بەکەسەوە چییە چۆن بەش دەکرێت، خوای گەورە دیاری کردووە چۆن  وەرەسە دابەش بکرێت لەوەها کاتێکدا لەناو کۆمەڵگایەکدا تەکلیفە بەسەر موسڵمانانەوە میرات دەبێت دابەش بکرێت.

ئەگەر حکومەتی ئیسلامی بێتو بیەوێت بەرنامە جۆرێکی تر جێ بەجێ بکات لە ڕووی بەرژەوەندی و ناردنەوە تەسلیمی تر بگرێ ئەوە جیایە، بەڵام قسە لە پێویستی گشتی موسڵمانێ دەکەین کاتێك میراتەکەی کێشەی هەیە لەناو کۆمەڵگەیەکدا بە ناوی پێویستی مەردم پەیوەندی نییە بە حکومەتەوە، بەڵام خوا داینوە و ئەبێت ئەنجام بدرێت، بەو جۆرە ئەم

میراته بەش بکرێت له بەینی وەرەسەدا، ئینسان که وەسیەت دەکات بۆ یەکێ له وەرەسه یان تەنها ناوی منالأنی کوڕ دێنێت، ئەو کەیفیەتەو ئەو نەحوەو تەقسیمه که خوا دیاری کردووه دەیگۆڕێو دەیخاته سەر بارێکی تر، گەورەترین مەعصیەته وەك ئەوە وایه جەنگ لەگەڵ دین بکات یان ئاشکرا بڵێت ئەم قانونه دینیه لا ئەبەم یەکێکی تر دەهێنمه جێی بەڵام ناوێرێت وا به ڕاشکاوانه یان ڕووی نییەو پەردە پۆشی دەکات له کۆمەڵگەدا و ناوی دەنێ وەقف یان ناونیشانێکی تر، ئەمه هەمووی باتڵە، کەسێك له دین شارەزا بێت ئەشێ له ژێر کاریگەری ناوێکدا قەرار نەگرێت به ناوی وەقف یان هەر جۆرێکی تر ئاسانکاریو زیادە بداته هەر وارسێ بڵێ باتڵە، عینوانەکه لاباتو بەتاڵی بکاتەوەو ماهیەته شەرعیەکه بهێڵێتەوە بۆ قەزیەکە، که ماهیەتی شەرعی قەزیەکه عیبارەته له نێوان وارسەکاندا به پێی دین وای وتوەو ئەم ماهیەته شەرعیه ئەنجام بدرێتو هیچی تر قبوڵ نەکات.

ئەمێنێته سەر یەك لایەنی ئیستسنائی، بۆ نمونه له ناو یەکێ له وەرەسه خەسڵەتێ ببێ ئەگەر ئەم خەسڵەته له غەیری وارسیشا بێت هەر لەبەر ئەو خەسڵەته بیەوێت وەسیەتی بۆ بکات بۆ نمونه یەك نەفەری دەوڵەمەند لەژیانی خۆیدا بیمارستانێکی دروست کردووه، کتێبخانه یان دەرمانخانەیەکی دروست کردووه به خەرجی خۆی ئیدارەی دەکات و خزمەت دەکات به مەردم، یان بۆ نمونه کۆمەڵە کارێکی خێری هەیه که خزمەته بەخەڵك و پێویستیشی هەیه بەپارە، جا کاتێ که وەسیەت دەکات ئەگەر ئەو فەردە دۆست بێو وارس بێت یان بێگانه بێتو

نەیناسێ وەك یەك تەماشای بکاتو تەماشای ئەو خەسڵەتە بکاتو هیچی تر لەبەر ئەو خەسڵەتە بۆ دابینکردنی پارەی ئەو کارەی بۆ نمونە دەرمانخانەکە یان کتێبخانەکەی یان هەر شتێکی وەسیەت بکات بڵێ ئەوەنە لە ماڵم  بدرێتە فلاّن کەس، ئەگەر ئەو کەسە خەدەماتی وا هەیەو لەبەر ئەو خەدەماتە کەسێ بیەوێ وەسیەتی بۆ بکات وارسیش بێت قەیناکات ئەمە کە وارسە نابێتە مانع کە لەو لایەنەوە یارمەتی وەربگرێت و کۆمەکی پێ بدرێت بۆ بەردەوامبونی ئەو پڕۆژە خێریە، واتە وارسیەتەکە بە جهەتی ئەم کە خود وارسیەتە مانعە لەمە کەسێك زیادە بەش بکات بەو شەخسە، ئەو کەسەی کە مەوروسە یەعنی کەسێك کە ئەمرێ ئیجازەی نییە ئیزافەی بەشێکی پێ بدات، ئەما ئەگەر لەم لایەنەوە نەبوو واتە لە لایەنی واریسەوە نەبوو، بەڵکو لە لایەنی ترەوە بوو ئەوە هیچ کێشەیەکی نیە، کابرا وەسیەت بکاتو میقدارێك لە ماڵەکەی بۆ ئەوە تەرخان بکرێت، دوایش جێبەجێ بکرێت، یانی ئەبێت وەسیەتەکە ئەنجام بدرێت.

وا فەرز دەکەین ئەم شەخسە وارس نیە، خەسڵەتێکی تێدایە لەبەر ئەو خەسڵەتە ئەم کابرا وەسیەتی بۆ کردووە، ئەسڵی وەسیەتو تەعەلوق میقدارێك لە ماڵی ئەو کابرایە وەسیەت بەم کابرا کراوە، واتە لەبەر خاتر ئەو خەسڵەتەیە نەك لەبەر وارسیەت، تەنها لەم لایەنەوە ئەگەر کابرا وەسیەت بکات بۆ شەخسێ شتێکی پێ بدرێت شەرعییەو هیچ کێشەیەکی نییە، جگە لەمە بەهەر تەرتیبێك بەهەر دەلیلێك بەهەر جۆرێك بێت، ناوی وەسیەت بێت، وەقف بێت، بەیع بێت، نەزر بێت هەرچی بێت هەر باتڵە. بەتایبەتی لەناو تەواو ئەم وەسیەتانەدا وا بۆ واریسەکە ئەکرێ،

خوێن تاڵترین‌و قێزەونترینیان وەسیەتی تایبەتە بۆ منداڵی کوڕ، واقیعەن ناپەسەندە وەك ئەوەی لە جاهلیەتدا هەبوو کچیان بە نەنگی‌و عار دەزانی، کاتێك ئیسلام بیرکردنەوەی مەردمی گۆڕی لەبارەی کچانەوە، ئەم قانونەی دانا کە دەبێت میرات بدرێت بە کچ بە خوشك، ئەمە لە ڕوانینی مەردمی جاهیلی زۆر تاڵ بوو، ئەوان بە شایەنی ژیانیان نەدەزانی، هەڵبەتە ئەمە زیاترلای ئەشراف وابوون نەك کەسی ئاسایی‌و سادەکان، ئەساسەن ئەشرافەکان بوون بە شایانی ژیانیان نەئەزانی ئێستەش دوای مردنیان ببنە وارسی میراتیان‌و لە ماڵەکەیان بەشیان بدرێت؟! ئەوانەی دێن وەسیەت بۆ کوڕەکانیان وەك ئەو ڕۆحە زیندوو دەکەنەوە کە کچ بە شایانی ژیان نەزانن لە باتی بێن بڵێن لە میراتم بەشی کچ مەیەن دێن ئەو ناوەی بۆ دادەنێن‌و دروستی دەکەن، کابرا دەڵێت ئەم ماڵەم ئەو سامانەم ئەو باخ و دوکانەم وەقف بێت بۆ کوڕەکان، هێشتا ئەگەر بۆ یەك مەرحەلە بێت بڵێت میرات مەدەن بە کچەکانم، میراتەکەم بدرێ بە کوڕەکانم تاوان‌و گوناهی کەمترە لەوەی بڵێ ماڵەکەم وەقف بێت بۆ کوڕەکان، چونکە بۆ ئایندەش خەریکە دەخالەت دەکات، کوێخایی دەکات کە ئیجازە نادات لە ئایندەشدا وەرەسەی غەیری کوڕەکان بدەن. واتە سەرپێچییەکی بەردەوامە، لەبەرئەوەی وەزیفەی کەسانێکە کە فەتوا ئەدەن گۆڕانکاری بە ماهیەتی مەسائیل بکەن، بزانن ماهیەت‌و مەتڵەب چییە؟ ئەگەر زانیان ماهیەت‌و مەتڵەب ناشەرعییە، ئەم کڵاوە شەرعیە ئەم حیلە شەرعیەو ئەم تەدبیرو فرت‌و فێڵە شەرعیە ئەم کراسە درۆیە کراوەتە سەر ماهیەتەکان بهێننە لاوەو بە پێی فەتوای شەرعی فەتوا

بدەن، هیچ وەخت ئیجازە نەدەن تەسەروفاتی بەو جۆرە دژی ئیسلامی جێبەجێ بکرێت، شت گەلێك هەن لە ناو خەڵكدا، كاتێك كەسێك ئەمرێت خوشكو برای بێت، یان كوڕو كچی هەبێت، كۆمەڵێ لە ژنەكان، هەندێكیان یان گشتیان بەشی خۆیان لەو داراییە هەڵناگرن و ئەڵێن بەشەكەمان بۆ براكانمان، كەم لەمانە بەو بەخشینی شەرعی هەیە، بەزۆری ڕوگیریە، زۆربەی ئەوەیە چونكە ئەو خەسڵەتە جاهیلیە میقدارێك دووبارە لە ناو كۆمەڵگەی ئێمە تاوی هەیە كە میرات نەدرێت بە كچ، كچەكان وا دەزانن عەیبە بۆیان تەماع بكەن لە ماڵی ئەو كەسەی كە وەفاتی كردووە، باوكە یا برا یان هەركەسێك هەیە بەشی ماڵ بەرن بۆ خۆیان لەژێر كاریگەری ئەوەیە، ئەوە ناشەرعیەو باتڵە، نابێت جێبەجێ بكرێت، دەبێت بەشی میراتی خۆیان پێ بدرێت، لایەنی شەرعی نابێ لە ژێر كاریگەری هیچ عورفو ڕووگیریو هیچ كاتێ لە وەخت ئیمكاناو بە مەیلو ڕەغبەتی ئینسانێ نابێت هیچ قەیدو قیودێك وا دیاری بكات كە بەشێ لە ماڵ خۆی ببەخشێ بە كەسانی تر، ئەگەر وابێت ئەو جۆرە سەرف نەزەرە شەرعی نیەو باتڵە.

ئەمێنێتە سەر ئەوە كە بۆ زۆر كەس هاتوەتە پێش، بۆچی ئیسلام بەشی ژن و پیاوی وەكو یەك دابەش نەكردووە؟ یا سەهمی زۆری داوە بە پیاو و كەمی داوە بە ژن، ژن نیوەی پیاو دەبات، یان خوشك نیوەی برا؟!

لە ڕاستیدا مەسەلەكە زۆر پێچەوانەیە ئەشێ پرسیار بەو جۆرە بكرێت بۆچی ئیسلام بەشی زۆری داوە بە ژنو پیاویش كەم! واقعیەتی مەتڵەب ئا ئەوەیە، چۆن؟ لە هەر مەوزوعێكی كۆمەڵایەتیدا، ئەوانەی وا سەرنجیان دابێت ئەزانن، كۆمەڵێك مەسەلە كە لەیەك مەوزوعدا هەیە

پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە، بەشێوەی یەك کۆمەڵەو بە شێوەی یەك سیستەم، وە هەر بەشێك لە ئەجزای ئەو کۆمەڵەیە بە ئیعتباری پەیوەستبونی لەتەك بەشەکانی کۆمەڵەکەدا، لەناو ئەو سیستمەدا مەفهوم پەیدا دەکات نەك بە تەنیا، ئابوری لە ئیسلامدا سیستەمێکە، کۆمەڵەیەکە بەشی یەکجار زۆر و فراوانی هەیە، کە هیچ کام لەم بەشانە بەتەنیا لەباقی بەشەکانی تر نابێت تەماشا بکرێت، بە ئیعتبار کۆمەڵەکە هەربەشێکی جێگەیەکی هەیەو قابیلی شیکردنەوەی هەیە، ئەگەر کۆمەڵەی ئابوری ئیسلامی تەماشا بکەین، ئەو کاتە تێئەگەین بە ڕواڵەت لە ڕووی ماددیەوە زوڵم لە پیاو کراوە، بەشی زیادە دراوە بە ژن، ئەمەش هەڵبەتە لە ئاست مادیەوە، بەڵام لە دواییدا تێدەگەین کە بەڵێ لە ڕوی مادییەوە زوڵم لە پیاو کراوە، بەڵام لە هەموو ڕوویەکی مادیو مەعنەویەوە تەماشا بکەین زوڵم نەکراوەو یەکسانبونی کامڵ بەرقەرار کراوە نەك ڕواڵەتی...

لەلایەنی کامڵو شاملی ئینسانیەوە، ئەگەر ببینین لە سیستمی ئابوری ئیسلامیدا هیچ جۆرە تەکلیفێکیماڵی لە ژن نەکراوە، ژن دەوڵەمەند بێت یاخود هەژار بێت، هیچ کات تەکلیفی لەسەر نییە، ژنێك شوی کردبێت بە پیاوێك تەواوی تەکالیفی ماڵی ئەو ژنە بەسەر ئەو پیاوەوەیە، منالی هەبێت هەمووی بەسەر پیاوەکەوەیە، ئەم ژنە موکەلەف نیە یەك قەران لە دارایی خۆی بۆ خۆیو منالو مێردی خەرج بکات. ئێستە ئێمە کۆمەڵگە بێنین لەشێوەی دوو خانەوادە نمایشی بکەین لە زهنی خۆماندا، خانەوادەیەك کوڕو کچێکی هەیە، خانەوادەکەی تریش کوڕو کچێکی

هەیە، مەورسی ئەو خانەوادەو سەرپەرشتیاری  ئەو خانەوادە ئەمریۆو سێ تمەن دارایی هەیە، مەورسی خانەوادەکەی تریش ئەمریۆو سێ تمەنی دارایی هەیە، مەورس ئەو کەسەیە کە میراتەکەی ئەدرێتە وارس، قانونی ئیسلام لە بارەی زاتی میراتەکەوە دوو تمەن بۆ کوڕەکەو تمەنێکیش بۆ کچەکە دائەنێ، بەهەمان شێوە بۆ خانەوادەکەی تریش، بەپێی سیستمی ژیان کوڕو کچ هاوسەرگیری دەکەن، کچی خانەوادەی یەکەم هاوسەرگیری لەگەڵ خانەوادەکەی تر دەکات، کچی خانەوادەی دووەم هاوسەرگیری لەگەڵ خانەوادەی یەکەم دەکات، هەروا بە پێی سیستمی ئابوری ئیسلامی شیکردنەوە بۆ ژیانی ئەو دوو خانەوادەیە بکەین، دوو خانەوادەی تازە دروست بوو، لە ئابوری ئیسلامیدا، ئەم کوڕە کە کچی ئەو خانەوادەیەی خواستووە، واجبە لەسامانی خۆی، لە دارایی خۆی، ژیانی خۆیو ئەو کچەی خواستویەتی دابین بکات، چەندێکی هەیە؟ دوو تمەنی هەیە، ئەو کچە لە سەروەتو مەورسەکەی خۆی تمەنێکی هەیە، تەکلیفی نیە یەك قرانی لێ خەرج بکات لە ماڵی مێردەکەی، کچی خانەوادەکەی تریش بەهەمان شێوە یەك تمەنو هاوسەرەکەشی دوو تمەنی هەیە، خوشکەکەی تمەنێکی لەگەڵ خۆی بردووە، ئەو کوڕەش بەو دووتمەنە ئەبێت خەرجی خۆی و ژنەکەی دابین بکات، ئیتر دوای ئەوە کار ئەکاتو کاسبی ئەکات و زەحمەت ئەکێشێ، ئەگەر نا مەعلومە ئەو ماڵە تەنها بە میرات ناچێت بەڕێوە، کۆمەڵەیەك  تەواو خەرجیەکانی ژن بەسەر پیاوەوەیە، لەوێ وەختێ ئێمە لەناو ئەم سیستمە ئابوریەدا تەماشای قەزیەی میرات دەکەین، تەماشا دەکەین کابرا دوو تمەنەکەی خەرج دەکات بۆ خۆیو ژنی، بەڵام ژنەکەی تمەنەکەی هەر ماوەو لایەتی، هیچی لێ خەرج ناکات

مەگەر خۆی کاسبی یان مامەڵەو بازرگانی پێوە بکات یان کشتوکاڵ، هەر زیاد دەکاتو زیاد دەکات، واجبیش نیە یەك قەرانی لێ خەرج بکات، هەڵبەتە ئەوە یەك مەسەلەی ئەخلاقیە کە ژن ئەوەنە ماڵ لە نەزەریا گرنگ نەبێتو لای خۆی نەیهێڵێتەوە و لەناو خانەوادەی خۆیدا خەرجی بکات، ئەگەر نا تەکلیفی دینی نیە.

لە سیستمی ئابوری ئیسلامی ئەمە نیە کە ژن تمەنێ یان هەرچییەکی هەیە بێت لەناو  خانەوادەکەیدا خەرجی بکات، بەس واقعیەتی قەزیە تەماشا بکەی، ئەوەی پێش دێت لە کۆمەڵگادا، کوڕ ژن دەخوازێتو کچ شوو دەکات، نیزامی گشتی کۆمەڵگە نەك بە بەشێوەی ئیستسنائی کە ئەگونجێ کچێ شوو نەکات، یان کچەکە مێردەکەی بمرێت، وە تەماشای بەرنامەی ئابوری ئیسلامی بکەین ئەڵێی بەڕواڵەت زوڵم لە پیاو کراوە، پیاو ئەو دوو تمەنەی هەیەتی ئەبێت خەرجی خۆیو ژنەکەی بدات، بەڵام ژنەکە ئەو تمەنەی هەیەتی موکەلەف نیە هیچی لێ خەرج بکات، بەس لە حەقیقەتدا مەسەلە ئەمە نیە بڵێی نیوەی پیاوی هەیە، یاخود پیاو وەك ئەوە وایە هیچی نەبێت، ئا بەو جۆرە وەختێ بە سیستمە ئابوریەکە تەماشای قەزیەی میراتی ژنو پیاو بکەین لەوە تێدەگەین کە زوڵم لە پیاو کراوەو ئیمتیاز بە ژن دراوە لە بەرامبەر ئەو جاهلیەتەوە وا بوو کە ئەشراف بوونی کچو ژنیان بە نەنگ دەزانی و نابوتیان دەکرد، ئیسلام هاتووە ئیمتیازی وای پێ داوە بە زیادەڕەوی دەزان، بۆچی ئیسلام ژنی موحتەرەم کردووە ئەوەنە بەشی زیادەی بۆ دانراوە؟! جا ئەمێنێتەوە سەر ئەمە کە وتمان لە ڕووی مادیەوە تەماشا ئەکەین زوڵم لە پیاو

کراوەو ئەو زیادە بەشانە دراوە بە ژن، بەڵام ئەگەر ئینسان لە ڕووی ماددیو مەعنەویەوە شیکاری بۆ بکەی تەماشا ئەکەی نا، دادپەروەری کراوەو ستەم نەکراوە، لە ڕووی مادیەوە بەڵێ دوو تمەن دراوە بە پیاو خەرجی خۆی و ژنەکەی لێ دەدات، ژنەکە تمەنێکی خۆی هەیە بەلام لە دوو تمەنی پیاوەکەی خەرج دەکات! زاهیرەن ئەمە زوڵمێکە کراوە لە پیاو، بەڵام لەڕاستیدا تەماشا ئەکەی ژیانی ئینسان تەنها ژیانی مادی نیە، ژیانی ماددیو مەعنەویە بەیەکەوە، ئینسان بەوە ئینسانە، کاتێ ئاوا لە هەموو ڕوویەکەوە تەماشای ژیان بکەی، دەبینیت زوڵم نەکراوە لە پیاو بەس دادپەروەری جێ بەجێ کراوە، بۆ؟

یەکەم. شێوە گەلێکی ئیستسنائی هەیە کە مومکینە ژنێك هەبێت پیاوێك نەبێت موتەکەلفی خەرجیەکانی بێت، بەس با بەشی یەك نەفەری ببێت، پیاو با بەشی دوو نەفەری بوێت، بەهەر حاڵ چونکە موتەکەلفی خۆی و ژنەکەیەتی تەنانەت ئەگەر مناڵیشی نەبێت، بەڵام ژن بەشی یەك نەفەری هەبێت لە میرات، ئەمە کارێکی ئیستسنائیە و نابێتە قاعیدەیەکی گشتی، ئەوەی کە ئەیبینین بەهۆی بەرژەوەندی ژیانەوە خودای گەورە ساختمانو وجودیەتی ژنو پیاوی متەفاوت دروست کردووە، ئینجا ئەگەر بڵێین بۆچی وایە زۆر درێژە دەکێشێت، هەروا ئاماژەیەك ئەدەم و ئەڵێم بەرژەوەندی ژیانی ژنو پیاو، ئاوا یەکسان و تەواوکار دەبێت کە خوا دیاری کردووە، خوا وەزعی جسمانی ژنو پیاوی متەفاوت دروستکردووە، جەستەی پیاو بەهێزترو تۆکمەترە لەهی ژن، هەروەها بەرژەوەندی ژیان وای فەرز کردووە چونکە مەوجودێکە کۆمەڵایەتیو بە جۆرێك بەشەکانی خانەوادەیی ڕوو بەکۆمەڵگە لەسەر شانی پیاوە، هەر لەبەر ئەم ئەرك و

بەرپرسیارییەتە بەسەر شانی پیاوەوە پێویستی بە بەهێزیەکی زۆر هەیە لە ڕووی جەستەییەوە، بەڵام بۆ ژن نا دیقەتو شەفەقەتی فرە نەك لایەنی جەستەیی، لە ئاست ڕەوانیشەوە دووبارە تەفاوت گەلێ هەیە کە ساختمانی ڕەوانی پیاویشی بە جۆرێك دروست کردووە میقدارێکی زۆر متەفاوتە لەگەڵ ژن، ئەمە بەرژەوەندی ژیانەو ئێستە کارمان بەسەریەوە نیە، بەڵام واقیعیەتەکە ئەبینین و دەزانین وایە، پیاو بەهێزتر و زۆردارترە لەژن، ئەمە ئیمتیازێکی مادییە بۆ پیاو، واتە لەباری مادییەوە پیاو لەپێشترە لەژن، ئینجا بیری لێ بکەنەوە ئەگەر لایەنی مەعنەوی شەخصیەتی پیاوی دروست نەکردبێ، مەعمولەن لە ڕەوابتی زۆرداری بێ زۆرا، زۆرداری ستەم ئەکەن لە بێ زۆری، خەسڵەتی ئیستکباریان تێدا پەیدا دەبێت ئەوە لەناو کۆمەڵێك ئینساندا ئەبینرێ.

ئەنجام ئەگەر پەروەردەی ئیسلامی ئیمانو ئەخلاقی ئیسلامی نەبێتە ڕێکخەری ژیان، وەختێ کەسێ لەساتی قودرەتی مادییەوە (مەبەستمان لە جەستەیە) غرور بەسەر کەسێکی تردا دەنوێنێت، ئازاری دەدات، گەورەیی ئەفرۆشێت، هەر دەستورێکیدا جێبەجێ بکرێت، ئەمە شتێکە ئەیبینین و خەسڵەتی مەسڵەحەتی ژیانە و ئەبێت وابێت، دین هێناویەتی لەناو مەجموعەی سیستمی ژیانا نەك سیستمی ئابوری. مەجموعەی دین ئەویش سیستەمێکە، چونکە ئەکرێت چەند دانە سیستمێکی بچوك لەناو سیستەمێکی گەورەدا جێی بکرێتەوە، هەروا بەشەکانی سیستەمی بچوك بەیەکەوە ڕەبتیان هەیە، ئەشێ بەشەکانی هەر سیستمێ لەتەك باقی بەشەکانی هەر سیستمەکانی تر لەناو مەجموعا ڕابیتەیەك بێت. لەناو

مەجموعەیەكدا كە سیستەمی دینە هاتووە، لەیەك بارتر لە بارەی مادییەوە ئیمتیازی داوە بە ژن، چونكە پیاوێك پەست بێت شعوری مەعنەوی لە خوارەوە بێت ئەخلاقی مەعنەوی لەخوارەوە بێت ئەهەمیەت دەدا بەو لایەنە مادیە كەخۆی هەیەتیو ناز ئەفرۆشیو غرور ئەفرۆشی بەسەر ژندا، ئەو مادیاتە لە نەزەری ئەوا گرنگە، لەبەر ئەوە ئیمتیازی مادیی داوە بە ژن، دیارە كە ئەم پیاوە زۆر گرنگی بە مادیات دەدات، دێت بەو جۆرە لە ڕووی مادەوە بەش دەدات بە ژن كە كابرای پەست تەماشا ئەكات ژنەكەی دەوڵەمەندە و هەیەتی ئا لەبەر ئەوە ئیحترامی ژنەكەی ئەگری، تاوەكو وەهای لی بكات لەبەر چاو شوەكەیەوە یەكسان بێت لەگەڵ خۆیدا، بەبۆنەی ئەم لایەنە مادیەوە كە خۆی هەیەتیو جەستەی بەهێزترە غرور پەیدانەكات بەسەر ئەودا كە تەحقیری بكات ئەبینی ئەویش مادی هەیە كە یەكسانی لە نێوانیان دروست ئەبێت.

# زیارەتی کەعبە[1]

ئێمە ئەزانین کە ئیسلام  بت پەرستی قەدەغەکردووە و لەگەڵیشیدا جەنگاوە، بەلاّم پرسیار ئەمەیە، کۆمەڵە شتانێك دەبینین وەك تەوافی کەعبە یان قوربانی کردن لە حەجدا،حاڵەتێکیان هەیە جۆرێك لە بت پەرستی ئەنوێنێ، ئایا ئەمە چۆن  ئەگونجێ لەگەڵ ئەو شۆرەتەی ئیسلام هەیەتی کە دژە بە بن پەرستی؟!

بۆ وەلاّمی ئەم بابەتە پێویستە کورت و پوخت بڵێم کە مەسەلەی شیرك و تەوحید تەواو ڕۆشنکراوەتەوە بۆمان، بەلاّم زۆرێك لە نهێنی و ڕاز لە شیرك و تەوحیددا هەیە کەیەکجار وردە و بۆی هەیە ئێمە لەم سەردەمەدا هیچ پەی پێ نەبەین، چونکە بابەتی ڕاز و نهێنی لەزۆر شوێنی تریشدا هەن بەنمونە لە دەربڕین و تێگەیشتنی قورئاندا، یان ئەوەی کەلەم جیهانەدا هەیە و ئەو ڕاز و نهێنیەی ماددە هەیەتی هەربۆیە تەواوی ئەو شتانەی هەن ناکرێ و نەشبووە لەیەك کاتدا

---

[1] ئەم شیریتە لەبنەڕەتدا لەشاری کرماشان تۆمارکراوە لە ٨ی فروردینی  ١٣٦١ش کە دەکاتە (٢-٦/١٤٠٢)ك کە بەرامبەرە بە (٢٨-٣/١٩٨٢)ز. باسەکانی ناو شریتەکە بریتین لە (زیارەتی کەعبە، ئایاتی قورئان لەناو ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا، نەجاسەت و پاکوخاوێنی) ئێمە تەنها لێرە دیوی یەکەمی شیریتەکەمان هەڵبژاردووە بەپێی ئەو سنورەی بۆ ناونیشانی کتێبەکەمان هەڵبژاردووە.

بزانرێ، هەرلە بەرئەوەیە مرۆڤ هەوڵ ئەدا وردە وردە شت گەلێکی لێوە فێر بێت، جا ئەو هەمووە ڕازە لە مەسائیلی قورئانیشدا هەیە بەهەمان شێوەی ئەو ڕازانەیە لەم جیهانەدا مرۆڤ توانیویەتی قۆناغ قۆناغ کەشفیان بکات، بۆ نمونە چەند بابەتێك گەلێك لە بارەی شیرك و تەوحیدەوە لە قورئاندا هەیە یا لە فەرمودەکاندا هەیە یا لە سوننەتی عەمەلیا هەیە کە جاران نەزانراوە، بەلاَم ئیستا ئەیزانین و تاڕادەیەك لێمان ڕۆشنە، یان لەڕوی لایەنی فەلسەفیەوە شت گەلێك هەن نەزانراو بون، بەلاَم ئەوانەی ئێستا یان کاتی خۆیشی هەندێکیان لێیان ڕۆشن بووە و هەندێکیان نەخێر، هەتا ئیستەش هەیە دوای چواردە سەدە هەندێ شت هەیە لەبارەی شیرك و تەوحیدەوە ڕەنگ بێت ئەوانەی کەوا دەرکی فەلسەفیانەیان بێت بیزانن یان میقدارێ ڕۆشنتر لە گوزەشتە تێی بفکرن، بەلاَم زۆریان هەن کە ناتوانن و تێناگەن، بەنمونە﴿اللّهُ الصَّمَدُ[1]﴾(صمد)وەسفێکە بەخوا ئەوترێ، کێ ئەتوانێ لە مانای ئەم وشەیە تێ بگات؟! کەسێ کە دەرکی فەلسەفی و فەلسەفەی وردی جیهانی وجودی هەبێ ئینجا ئەتوانێ حالی ببێ و دەرك بکا، بەکورتی ئەڵێم ئەوەی وا لە جیهانی بوندا هەیە غەیری خوا هیچ شتێکی تر پەیوەست بە خودی خۆیەوە نیە نە لە بونیا، نە لەو کۆرانکاریانەی کە بەسەریدا دێن، هیچ شتێك ناتوانێ بونی لە خودی خۆیەوە بێ و کۆڕانکاریەکانی لە نەفسی خۆیەوە بێ، پێزانینەکانی لە خودی خۆیەوە بێ، یاخود سیفاتی لە خودی خۆیەوە بێ، هەرکیز شتێکی وا لە جیهانی بوندا نیە غەیری

[1] سورەتی (الإخلاص/ ٢)

خوای گەورە، ئەم خەسڵەتە بۆ خوا هەیە بە تەنها و دەبێ بزانین ئەمە شتێکی ئاسان نیە پەیوەست بون بەخود و ئە حواڵی وجودی ئینسان و ناتوانرێ لەمە حالی ببێت.

یەکێ لە خاڵە یەکجار گرنگ و بەرجەستەکان جیاوازی شیرك و تەوحیدە کە زۆرێك لە خەڵکی لەمە حاڵی نابن ودەرکیان نەکردووەو کوناهیشیان نیە، چونکە تواناى حاڵیبونیان نیە (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ) پەرستشی خوا و داواکردن لە خوا دەبێ لە ڕواڵەت و کردار و بیرکردنەوەدا ڕەنگ بداتەوە، ئەمەش هەموو کەسەکان وەکو یەك لێی حاڵی نابن، یان ئەگەر لێی حاڵی ببن  بەقەد یەکتری نیەو حاڵی بونەکەش فەرقی هەیە بۆیە بەشێوەیەکی گشتی بابەتی شیرك و تەوحید، بابەتێکە هەموو کەسەکان تێیدا وەکو یەك نین و جیاوازن، بۆیە هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەتان نەبێ کە تەواوی ڕازگەلی شیرك و تەوحید من حاڵیم ببێ و چاوەڕوانیشتان نەبێ، چونکە هەندێ بابەتی وردی شیرك و تەوحید هەیە نایزانم تاوەکو حاڵیم ببێ و ڕونکردنەوەی لەبارەوە بدەم، لە باری ئەم بابەتەوە بزانن ئەوە کە من ئەیزانم شتێکی تەواو کورت و کەمەو قەترە بەدەریاش نیە..

ڕونتر بڵێم لەبارەی هەماهەنگی و کاریگەری و پەیوەندی نێوان جەستەو ڕۆحی مرۆڤەوە ئەمەیە کە بەعزە شتێك هەیە لە بنچینەدا پەیوەندی بە ڕۆحەوە هەیە پەیوەندی بە جەستەوە نیە، بەعزە شتێکیش ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە جەستەوە هەیە و پەیوەندی بەڕۆحەوە نیە، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕێکخستنی جەستەو ڕۆح لە مرۆڤدا ڕێکخستنێکی تێکەڵوپێکەڵە و ناتوانین هەرگیز بڵێین ئەمە بریتیە لە جەستەو ئەمەش بریتیە لە ڕۆح،

وەکو ئەوەی وا ئەڵێین لە جەستەی مرۆڤدا ئەمە بریتیە لە سەر و ئەمە بریتیە لە قاچ و دەست، یا ئەمە چاوە ئەمە لوتە ئەوە دەمە، بەو جۆرە نیە و تەواو تێکەڵوپێکەڵە و پەیوەستن بەیەکەوە، تا مرۆڤ مرۆڤە کارەکە هەیەو قابیلی لێك جیاکردنەوە نیە، چونکە هەرچەندە بابەتێك موستەقیمەن پەیوەندی و ڕەبتی بە جەستەوە بێت میقدارێك پەیوەندی لەگەڵ ڕۆحیشدا پەیدا ئەکات، یاخود هەرچەندە بابەتێك موستەقیمەن پەیوەندی و ڕەبتی بە ڕۆحەوە بێت میقدارێك پەیوەندی لەگەڵ جەستەدا پەیدا ئەکات، جا لێرەدا دوو دانە نمونە دەڵێم بۆ ئەوەی بابەتەکە ڕونتر بێت

١-دەرمان خواردن بۆ مرۆڤی نەخۆش.

٢-دەرس خوێندن بۆ مرۆڤی نەخوێندەوار.

مرۆڤێك کاتێ سەری ئێشێ، یا قاچی دێشێ، کێشەی جەستەیی هەیەو ئیحتیاجی هەیە دەرمان بخوات بۆ ئەوەی لەم نەخۆشیە جەستەییە چاك بێتەوە، ئەمە بە ڕوکەش ئەزانین کە کارێکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەکەڵ لەشدا هەیەو کاریگەری لە جەستەدا دەرئەکەوێ، ئەگەر دەرمانەکە بە دروستی کاری خۆی بکات، جا تەماشا ئەکەین ڕۆحیش لێرە نەقصێکی هەیە ئەویش ئەوەیە دەبێ میقدارێ ڕەوانی بکات، بەنمونە میقدارێك لەلایەنی ڕۆحیەوە ئومێدەوار دەبێت و حاڵەتی ترس و فرە لەم شتانەی تر هەتا زۆرێك ئەڵێن لایەنی دەرونی نەخۆشەکە زۆر کاریگەرترە لە ڕۆڵی دەرمانەکە، چونکە هەر کاریگەریەکی خراپ یا باش لایەنی ئەرێنی و نەرێنی لە ڕۆحیەتی نەخۆشەکەدا دروست ئەکات.

ئەو نمونەی تر ئەوەیە کە کەسێك کاتێ ئەخوێنێت دیارە بۆ جەستەی نیە ئەمە بۆ ڕەوانیە و جەستە بەهرەیەکی نیە لە خوێندنەوەدا، بەلاّم دەبینین کە جەستەش فەعالیەتی هەیە و تا ئەوەی لایەنی ڕەوانی ئامادە بکات بۆ ئەوەی زانستەکە وەربگرێ بۆ نمونە چۆن خۆی جەموجۆر دەکا و کتێبەکەی لەملا دائەنێ ودەفتەرەکەی لەولاوە و یا کارگەلێکی مادی تر بە وەسیلەی جەستە کە قەڵەمەکانی ئامادە دەکات و سەری دائەنەوێت و دەست دەکاتە خوێندنەوە، ئەم کردارە پەیوەستە بە جەستەوە، یا بۆ نمونە شانیەتی کە وەختێماندوو بووە لە دانیشتن ئاوا شانی دائەدات و دەست ئەداتە خوێندنەوە.. جا لەمەوە دەگەینە ئەوەی هەمان کرداریش لە حەجدا بۆ ئامادەگی لایەنی ڕەوانی مرۆڤە، ئەم بابەتەیش دەبێتە دووبەش، :بەشێکی کە تەوافە بە دەوری کەعبەدا بە وەسیلەی ئەم خاڵە کە وتمان لە پەیوەندی جەستەو ڕۆح کاریگەری و ڕابیتەی ئەمانە لە یەکترینا دەرئەکەوێ بۆمان، هەڵبەتە وتمان ئەوە تەنها گۆشەیەکە لە مەتڵەب، ئەمەمان زانی بەلاّم زۆرێك لە ڕازی تر هەن کە نایانزانین. ئەم گۆشە لە مەتڵەب بۆ سەردەمی ئێمە و دەرکی ئێمە بەسە فیکرمان ڕۆشن بکاتەوە، هەروا ئەنازەیەك کە شت فێر ئەبین لە زەمانێکدا ئێمە یا بەشەر لە زەمانێکدا بۆ درك و شکڵی ئەو زەمانە کافیە، ئێستا فیکری ئێمە ڕۆشن دەکاتەوە، شایەت لە ئایندەدا بۆ مرۆڤەکانی تر کافی نەبێ، چونکە توانای تێگەیشتنیان زۆرتر بووە و مەعریفەیان لەمە فرەتر بووە، هەروەکو لە ڕابردوودا ئەشێ مرۆڤەکان پێویستیان نەبوبێ بەم میقدارە

بیزانن، چونكه تواناییان بەو جۆره نەبووه، پێویستیان بەو زانینه نەبووه.

قورئان لەڕوكردنه كەعبەدا بەر لەهەموو شتێك ئەمه به ئێمه حاڵی ئەكات ﴿وَلِلّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ[1]...﴾ واتا: (وا مەزانن كەوەختێ ئێوه بەرەو كەعبه دەڕوانن، ئەوه بەرەو خوا دەڕوانن، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا موتەعەلقه بەرەو هەركوێ بڕوانی هەر بەرەو خوا ئەڕوانی)، ئەی لەبەر چی ئەڕوانین بۆ كەعبه و ڕووی لێ ئەكەین؟! خۆ ڕوكردنه شوێن ئەسڵەن بۆ خوا مەترەح نیه چونكه ئەو ماددی نیه تا ڕوگه و شوێنگەی ببێ، ئەوەی سەروكاریشی لەگەڵ خوادا هەیه ڕۆحه نه جەستەی ئێمه، ڕۆحی ئێمه ڕوگەی نیه و كارێكی به ڕوگەوه نیه، جیهان و مەسائیلی ماددی بۆ جەستەی ئێمه بونی هەیه نه بۆ ڕۆحی ئێمه، ئەی مەسەله چیه لەبارەی ڕێكخستنی ئەم بابەتەوه شوێنێك دەكرێته گەورەترین سومبول و دیاریكردنی بینایەكی وەكو كەعبه بۆ ڕوتێكردنی قیبله؟! ﴿قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا[2]﴾ نائارامی وئیستیرادێكی هەیه مرۆڤ بۆ ڕوو له خواكردن، لەبەرچی؟! لەبەرئەوەی له لایەكەوه ڕۆح و دەرون هیچ شوێنێكی پێویست نیەو ڕوگەیەكی لازم نیه دەرك ئەكا كه بۆ خوا ڕوگه نیه، بەڵام لەلایەكی ترەوه جەسته پەیوەسته بەیاساكانی مادەوه و ڕوگەی پێویسته و ئیحتیاجی پێی هەیه، بۆیه له كارێكدا كه مرۆڤ ئەنجامی ئەدا كه هەم

[1] سورەتی (البقرة/ ١١٥).

[2] سورەتی (البقرة/ ١٤٤).

بەڕۆحی پەیوەستە، هەم بە لەشی، بە ڕۆح پەیوەستە بە تەوەری موستەقیم بە لەش پەیوەستە بە تەوەری غەیرموستەقیم و تەشویش دروست دەكات ئەو تەشویشەی كە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)دووچاری بۆوە، چ جای ئێمە، تەشویشەكە لەبەرچیە؟! لەبەرئەوەی كە ڕۆح ئیحتیاجی بە ڕوگەیەك بێ؟! نا، لەبەر ئەوەی نیازی جەستەمانە بەوە و ئەسڵی بەو جۆرەیە جا بۆ ئەوەی ڕۆح و جەستەمان هەماهەنگ بكەین لەپاڵ یەكتریا، چونكە ئێمە مرۆڤین و لە جەستەو ڕۆح پێكهاتوین، هەربۆیە هەڵەیە بڵێین مرۆڤی جسمانی یاخود مرۆڤی ڕۆحانی، ئەمە هەڵەیە مرۆڤ جسمانی ڕۆحانیە یان ڕۆحانی جسمانیە، ئەم دەستەوازەیە هەڵەیە و مەفهومێكی نیە لە بارەی مرۆڤەوە، كەسێك لە ئیسلام شارەزابێ ئەزانێ بۆیەك نەفەر مرۆڤ ئەگەر زۆرزۆر باشیش بێت بڵێین ڕۆحانی هەڵەیە، چونكە پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) بەو هەموو پێگەیەوە خوای گەورە وەكو مرۆڤێ مامەڵەی لەگەڵدا كردووە، چونكە بونە ڕۆحانی لە مرۆڤبون دەرئەچی و ئەبیتە فریشتە، بەڵام خۆ مرۆڤ گەورەترە لە فریشتە، چونكە هەم ڕۆحە و هەمیش جەستە، هەربۆیە دەبینین كەسایەتیەكی وەكو پێغەمبەریش (صلى الله عليه واله وسلم) ڕوگەی پێویستە لەبەرئەوەی تەركیبی جسمانی ڕۆحانیە، دەی ئەم خەسڵەتە هاوبەشە لە بەینی ئەمیش و باقی مرۆڤەكاندا ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ[1]﴾ قورئان دەستوری پێداوە بە مرۆڤەكان ڕابگەیەنە (منیش هەر مرۆڤێكم وەكو ئێوە) بە تەواوی تەركیبات و تایبەتمەندی و

[1] سورەتی (البقرة/ ١١٠).

پێویستیاتی مرۆڤیەوە ﴿يُوحَي إِلَيّ أنّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ ...﴾[1] واتا (تەوحید بە ئێوە نیشان بدەم، من مەپەرستن، مرۆڤەکان مەپەرستن و مەبن بە بەندەیان و مەبنە بەندەی غەیرە خوا)جا لەمەوە دێینەوە سەر ئەو پرسیارە ئەی چۆن بەدەوری کەعبەدا تەواف ئەکەین؟! ئایا کەعبە خۆی شایستەی ئەوەیە مەرکەزی مرۆڤەکان بێت؟ نەخێر کەعبە شایستەیی ئەوەی نیە کە سوجدەی بۆ ببەی بەو جۆرە کە لە قورئاندا هەیە جونکە تۆ سوجدە بۆ خوا ئەبەی نە بۆ کەعبە، بەلاّم ڕوگەت ئەوەیە لەبەر ئیحتیاجی جەستە، لەکەعبەشدا وەختیٚ تەواف ئەکەی بەدەوری کەعبەدا مەسەلەیەك بەو جۆرە هەیە کە فرە پێچیدەتر و گرنگ و بنەڕەتیە ئەویش ئەوەیە کە وتمان، ئەمە پەیوەستە بە نیازی جەستەوە، ئایا ئەمە ڕۆشنە؟! حەتمەن بۆ ئەوانەی وا سەروکاریان لە تەك مادیا هەیە، ئەمەیان زیاتر لا ڕۆشنە کە جوڵەی بنەڕەتی و سروشتی لەجیهاندا، جوڵەی بازنەیی و دەورانیە، بە نمونە جوڵەی ئەلیکترۆنەکان یان جوڵەی سەیارەکان و ...... ئەمە ڕازێکە لەم جیهانە مادیەدا وجودی هەیە کە تەواوی مەوجوداتی جیهانی مادی پێوەی پەیوەستە ئەگەر جوڵەی دەورانی لە جیهانی مادە بستێنیتەوە، ئەوا جیهانی مادە پوچ و بەتاڵە، ئەزانن هەندیٚ تەقینەوە ڕوئەدات لە ئەتۆمدا هۆکارەکەی ئەوەیە کە جوڵەی دەورانی ئەشێویێ، بەسەرنجدان لەم ڕاستەقینەی لە جیهانی مادەدا هەیەو پەیوەستکردنی ئەم بابەتە بە مەسائیلیٚ وا لە مرۆڤدا هەیە کە جەستەیەتی، تێدەگەین کە خوای گەورە جوڵەی مرۆڤەکانی لەم

---

[1] سورەتی (البقرة/ ١١٠).

جیهانەدا بەپێی ئەو سیستمە گەوردونیەی بۆ جیهانی مادە دایناوە ڕێکیخستووە، کەواتە ئەسڵ چیە لەم گەردونەدا؟ ئەوەیە هەموی یەك بێت، واتا مەرکەزێك هەبێت و تەواوی ئینسانیەت بەدەوریدا بن، لەمەوە تێدەگەین لە مانای (الأمة الواحدة)، مەسەلە ئەوە نیە چەند دانە ئوممەت بێت، بەڵکو ئەبێ یەك ئوممەت بێت، چونکە کە بووە چەند بەشێك و هەریەکەیان مەرکەزێکی خۆی بێت، ئەو کاتە ئەسڵ و بنەڕەتەکە تێك دەچێ، چونکە ئەبێ تەواوی مرۆڤەکان یەك ئوممەت و یەك مەرکەز بن، بەرنامەش لەلایەنی خواوە بۆ ئەوە هاتووە کە حەرەکەتی جیسمانی ئینسان کە ڕابیتەی هەیە لەگەڵ ڕۆح و دەرونی مرۆڤدا و هەماهەنگ بێت لەگەڵ حەرەکەتی گشتی جیهانی مادەدا، خوای گەورە ئەم مەرکەزەی بۆ داناوە و بەرنامەیەکی بۆ داناوە، هەماهەنگ بێت لەتەك جوڵەی تەواوی مادە کە ئەزانین هەر لە وجودی خۆشماندا، چەند ملیار مەنزومە بونی هەیە بەم جوڵەیەوە، هەروا لە دەرەوەی بونی خۆماندا جوڵەی سروشتی بە مادە جوڵەی دەورانیە و ئەسڵی جوڵەکە ئەوەیە، لەبەرخاتری ئا ئەو ڕازەیە کە جەستەی ئێمەش ئەشێ هەماهەنگی بکا لەتەك دەرون و ڕۆحماندا، وە لەبەر خاتر ئەم ڕازەکەی تر کە جەستەی ئینسان لەبەر ئەوەی مادەیە لازمی بە جوڵەیەك هەیە کە هەماهەنگ بێت لەتەك تەواوی جوڵەی جیهانی مادەدا، تاوەکو بتوانێ ببێتە بەشێك لەوە، وە لەبەر خاتری ئەم خاڵەی تر کە تەواوی مرۆڤەکان یەك کۆمەڵە بن نەك چەند کۆمەڵێکی جیاجیا، خوای مرۆڤ کە جیهانی مادەی ئاوا خەلق کردووە، وە ئەزانین کە مانەوەی ئەم جیهانی مادە بەو

شێوازە ڕێکخستنەیە، وە پێویستە لەسەر مرۆڤ لەلایەنی جەستەییەوە لە یاسای جیهانی مادە لانەدا، بەڵکو تەواو هەماهەنگ بێ لە تەك جیهانی مادە، ئەو بەرنامەی بۆ داناوە کە بەوجۆرە  بە خەتی دورانی لە مەداری جیاجیادا بە دەوری کەعبەدا بسوڕێنەوە، ئەمەش بەهۆی پیرۆزی و گەورەیی کەعبەوە نیە، بەڵکو تەنها لەبەر پەیدابوونی مەرکەزێکە بۆ پێناسی جەستەی ئێمە کە ئیحتیاجی پێی هەیە چونکە جەستەمان مادەیە، ئەشێ قابلی مادی لە مەوردی جەستەماندا پەیدا بکەین، ئەگینا دەرون و ڕۆحمان هیچ پێویستیەکی بەوە نیە، ئەمە یەك دانە لەو خاڵانەیە کە هۆکاری پێویستبونی سوڕانەوە بەدەوری کەعبە پیشان ئەدا یان ڕوکردنە کەعبە[١].

---

[١] ئەساسی ئەم بابەتەم لە مەرحوم دکتۆر شەریعەتی بیستووە، یان ڕاستر بڵێم لە کتێبێ کە بۆیان خوێندومەتەوە بەناوی(حەج)ەوە، چونکە وەختێ دێتە نەزەرم، ئەو ئیشارەت و باسانەی کردم ئیتر نازانم تا چەند بەو جۆرە بێت وا ئەو لەباسی جوڵەی مرۆڤ بەدەوری کەعبەدا وتویەتی، بەلاَم ڕونکردنەوە و شیکردنەوەکانی ڕەنگ بێت تێگەیشتنی خۆم بێت نەك دەقاودەقی وتەکانی ئەو. (موفتی زادە)

## قوربانی کردن

قوربانی کردن نە بە کەعبەوە پەیوەستە، نە بە هیچ جێگەیەکی ترەوە پەیوەستە، قوربانی کردن پەیوەستە بە هاریکاری نێوان مرۆڤەکانەوە و مەسئەلەیەکی ئینسانیە، کە لەڕۆژانی جەژنا بە پەیڕەوی ئیسلامی نەك وەك ئەوەی کە ئێستا هەیە، گۆشت کە گرنگترین خواردنی مرۆڤە و کەمیش دەست ئەکەوێ، کاتێ ئەو هەموو خەڵکە لەو شوێنە جیاجیانەی جیهانەوە ڕودەکەنە کەعبە و عیبادەت دەکەن، لەو ڕۆژەدا کەوا ئەبێتە جەژنیان گشت بتوانن لەم مادە خۆراکیە گرنگە بەشێوازێکی یەکسان بێ سەرو بان و خوار سودی لێوەربگرن، و هیچ کەسێ ئیحتیاجی بەکەس نەبێ، بەڵام ئێستا بەداخەوە ئەبینین کە ئەم مەتڵەبە لەگەڵ ئەساسیاتی دیندا ناجۆر و ناتەبا کراوە، بەشێوەیەك لەو ڕۆژەدا ئەوەنە حەیوان سەرئەبڕدرێ زیاد لە پێویست و ئیحتیاجی ئەو مرۆڤانەی وا لەوێن، کە دوایی چاڵی بۆ دەکەن و حەیوانەکەی تێئەکەن و خۆڵ ئەکەن بە ملیا، ئیتر کەس نازانێ ئەرێ ئەم قوربانیە بۆ چی بوو؟! ئەمە چ جۆرە هاوکاری کردنێك بوو لە مەردم کە حەیوان سەرببڕدرێ و بکرێت بەژێر خاکەوە، جا ئەو ساڵەی ئێمە چوین بۆ حیجاز، جەماعەتێك لە تەکما بون حاڵیانم کرد کە یا لە ڕۆژێکی ترا سەری ببڕن، یا بیکەنە هەدیە یان ئەسڵەن قوربانی مەکەن خۆ قوربانی واجب نیە، تۆ لەملاوە سوننەتێك

ئەنجام بدەی، لەولاوە گەورەترین زیانی مادی بدەی کە عیبارەتە لە بەفیڕۆدان، چونکە لەلایەنی مادیاتەوە هیچ شتێ بەقەت بەفیڕۆدان پیس و خراپ و قێزەون نیە، چونکە ئەزانن دوژمنی ئەساسی دین و مرۆڤایەتی لەڕوانگەی ئیسلامەوە، یەکەم خۆبەگەورەزانین و خۆفشکردنەوە بەسەر مرۆڤەکان و مرۆڤ خستنە ژێر تەئسیر و ڕکێفی خۆتەوە، دووەم لەلایەنی مادیەوە بەفیڕۆدان و خەرجکردنی زیادەڕەویانەیە، ئەم حەرامە گەورە ئەنجام ئەدەن، وەلا چیە سوننەتێك ئەنجام ئەدەن، ئاوا موسڵمانان دورکەوتونەتەوە له ڕۆحی ئیسلامی ومەتاڵبی ئیسلامی و تەشریعی ئیسلامی.

# پرسیار و وەلاٚم لەسەر پەرستش

**- چ پارەیەك حەجی پێوە ئەكرێ؟**

**- پارەی خەڵك نەبێ، جا ئەگەر جارێ لە مامەڵەیەكدا سوێندێكی ناحەقی خواردبێ، یا قسەیەكی ناحەقی كردبێ، ئەوە نابێتە مانع، فەقەد ئەگەر پولەكە پولی خۆی نەبێ، مەعلوم بێ حەقی یەكێكی ها بەلاوە ئەو وەختە دروست نیە حەج بكات. وەختێ پوڵت گەیشتە ئەو حەددە كە تەئمینی ماڵ و منالێت بكەی و ماتڵ و موحتاج نەبن، بتوانی لەگەڵ ئەوەش بچی بۆ حەج و حەقی كەسێك نەبێ لەناو ماڵ و سەروەتەكەدا حەجت واجب ئەبێ، بەلاٚم وەختێك دروست نیە مرۆڤێك بەماڵێكەوە بڕوات بۆ حەج كە ئەو ماڵە وا بەلایەوە مەعلوم بێت هی خەڵكە، یان لە حەدێكیدا كە بزنی وا كلاٚوت لەسەر كەسێك ناوە و لێت ڕۆشنە، واجبە ئەبێ ئەوانە بدەیتەوە، جا دوای ئەوانە ئەگەر سەروەت و دارایت ئەوەنە ماوە كە بتوانی واجبە حەجەكەت بكەی، ئەگەر حەقێكی مەعلوم هەبێ بەسەرتەوە ئەبێ ئەو حەقە مەعلومە بدەی. ئەوانەی كە درۆ و تەڵەكە هەیە لەكار و مامەڵەیاندا، بۆ وێنە شتێك بە ٢هەزار تمەن ئەفرۆشێ و ئەڵێ ١٥٠٠ تمەن لەسەر خۆمە و ڕاستیش ناكات، هەر ئەوەنە یەكێ پوڵ و دارایی گەیشتە ئەو حەددە ئەبێ بچێ بۆ حەج و واجب ئەبێ لەسەری، مەگەر ئەوەی مامەڵەكە جۆرێك بێ ڕۆشن و ئاشكرابێت كە پولێكی زیادی**

له کەسێك وەرگرتبێت، ئەگەر مەعلوم بوو پوڵی زیادی لەکەسێك وەرگرتووە، دەبێ لە پێشاندا ئەوانە بداتەوە جا دوای ئەوە ئەوانەی داوە، ئەگەر ماوە بەلایەوە بەش حەج بکات ئەو کاتە حەجەکەی بکات دەنا ناچێت... ئەگینا زۆر کاری وا هەیە کە ئینسان ئەنجامی بدات لە حەجەکە گرنگترو لازمترە، لە شوێنەکەی خۆیدا شك ئەبات زۆر کەس فەقیرە زۆر کەس نەدارە وە خەڵك وەزیفە دینیەکانیان ئەنجام نادەن، خۆ ئەگەر کۆمەك بەوانە بکات و هیچی نەمێنێتەوە بۆ حەج ئەو کارەی چاکترە، تاوەکو هیچ کۆمەك نەکا بە خەڵك و هەوڵی ئەوە بدات پوڵێ پێکەوە بنێت و پێی بچێ بۆ حەج، ئەو ئیحسانانە گەورەترە لە حەجەکە.

- دەبێ بۆ ڕۆژوو دەست لەکاروکاسبی هەڵبگری؟

- بۆ ئەوانەی بۆ ڕۆژوو دەست لە کاروکاسبی ئەگرنەوە، ئەگەر مەعلومی هەیە ئەو کاروکاسبیە لەو وەختەدا نەیکات پەکی ئەکەوێ، بەڵێ دروێنەکەیە و گێرەوکێشەکەیە هەر لەو وەختەدا ئەبێ، نابێ لەبەر ئەوە کە ڕۆژوو بگرێ واز لە کاروکاسبی و زیندەگی خۆت هەلگری، دەمێنێتەوە ئەوە کە هەر ئەندازەیەك پێی ئەکرێ ڕۆژووەکەی بگرێ و کاسبیەکەش بکات، ئەگەر زانی پێی نەکرا، نەك هەر ئەوە بخاتە دلی خۆیەوە بڵێ نایگرم و ناتوانم و ئەیخەمە پایزەوە ئەوە نابێ، هەر ڕۆژێ زانی پێی ناکرێ و لەتوانایدا نەماوە ئیشکالی نیە بیخوات و هەڵیگرێ بۆ کاتێکی تر بیگرێتەوە، بەلاّم من زۆرم دیوە کە ئینسانی ٦٠ساڵ و حەفتا ساڵە بون هەتا لە حەفتاش گەورەتر، لە هاوینی زۆر گەرم بە نمونە لە شارەزوور، لە بیرمە جیا لە ڕۆژووی ڕەمەزان ئەغڵەبە سوننەتەکانی تر و سوننەتی ٢شەممە و ٥شەممانیشیان گرتووە، دروێنەشیان کردووە، ئەگەر پیاو

کەیفی لێبێت و جیددی بێت لە وەزیفەکەی خۆیدا غالبەن ئەتوانن ڕۆژووەکە بگرن و کارەکەشیان بکەن، بەلاَم وەك عەرزم کردی، هەندێ ڕۆژ بینیان ناتوانن و کارەکەشیان پەکی ئەکەوێ ئەوە قەیدی نیە ڕۆژووەکەیان بخۆن و هەڵیگرن بۆ دوایی و بیگرنەوە..

- ئەی قوربان ڕۆژووەکە کە ئەگرمەوە ئەوە تەنها ڕۆژوویەکم گرتووە، یان قەرزەکەم لە کۆڵ کەوتووە؟

- نا گیانەکەم ئەوە ڕۆژوویەکی ڕەمەزانت لە کۆڵ کەوتووە، بەڵێ واجبەکەت لە کۆڵ کەوتووە، گوناهێکت نامێنێ بەسەرەوە، ئەگەر لەڕوی دەلیلێکەوە بێت.

- پاداشتی ئەو ڕۆژووەی لە ڕەمەزاندا گرتوتە؟ بەتەنها واجبەکەی لە کۆڵ ئەکەوێ؟

ئەی ئەگەر ئەو ساڵە نەتوانی واتە ڕەمەزانی بێتەوە بەسەرا؟

- ئەو کاتە ئەبێ فیدیەکەیش بدات و ئینجا ڕۆژووەکەش بگرێتەوە

- فیدیەکە بۆ ڕۆژێك چەندە؟

- هەرکەسێك لە ڕۆژێکدا چەند خەرجی هەیە، ئیتر هی سەرفیترە بێت، یان فیدیە بێت، یا هەر شتێکی تر، پیاو بە حسابی خەرجی خۆی ڕۆژی چەند خەرج ئەکات بۆ ژیان و خۆراکی خۆی، کابرا ئەگەر ڕۆژی ٢تمەن ئەخوا، فیدیەی هەر ڕۆژی دوو تمەنە، ٥تمەن ئەخوا، فیدیەی ڕۆژووی هەر ٥ تمەنە، ١٠تمەن ئەخوا ١٠تمەنە ئەسڵەکەی ئەوەیە.

- کەسێك سەرباز بێت زەکاتی پێ ئەشێت؟

- نا بەحسم کرد، ئەگەر سەرباز هەتیو و منالٚ بوو، یا بۆ نمونە باوك یا دایك یا پور یا کەسێکی کەمئەندامی بەسەرەوە بێت، لەبەر ئەوە زەکاتەکەی بێ ئەشێت، ئەگەر نا وەختێك خۆی لەسەربازیایە موستەحەق نیە، نانی ئەدەنێ و شوێنی حەوانەی پێ ئەدەن و لیباسی ئەدەنێ و میقدارێ پارەشی هەیە، ئیتر چ پێویستیەکی بەپارەیە.

- ئاخر کوڕی ئەو و کەسی ئەو پولٚی بۆ ئەنێرێ و ....

- ئێ با پولێشی بۆ نەنێرێ خۆ ئیحتیاجێکی نیە، خۆراکە و مەسکەنە و جلوبەرگە هەیەتی، ئیتر خۆ لە سەربازیدا کارێکی تری نیە، تا موحتاج بە شتێکی تر بێت! ئەو دوو ساڵەی سەربازی ئیشکالێکی نیە، جا ئەگەر وایە زەکاتەکەت بۆ بە ئەو ئەدەی چ ئیحتیاجێکی هەیە؟! نەوەڵا بۆ سەرباز ناشێ بۆ خۆی، خۆی پولەکە ببات و بیخوات، چون ئەگەر بیبات ئەیکاتە هەڵە خەرجی، پلاٚوی هەیە و گۆشت هەیە و لیباسی هەیە و جێ و نوێنی هەیە هەموو شتێکی هەیە، ئەغڵەبی خەڵکی دێ هەر بەو جۆرە ژیانی ئەژی، جا ئەگەر وابێ چۆن زەکاتی پێ ئەشێ؟! بەلاٚم ئەگەر کۆمەڵە کەسانێکی بەسەرەوە بێت کە ئەو بیان ژێنێت، لەکاتی سەربازیشدا ناتوانێ کاری تر بکات و بیانژێنێت، ئا لەو کاتەدا زەکاتەکەی پێ بدەی قەینا، بەلاٚم نەك لەبەر ئەوەی کە سەربازە و بۆ نەفسی خۆی، چون نەفسی خۆی ئیحتیاجێکی پێی نیە، ئەکەوێتە بەر هەموو کەسێ منالٚ و دەسکورتی.

- <u>نوێژ و ڕۆژوو بۆ مردوو دەگەڕێتەوە؟</u>

- نا وەلاٚ کاکە گیان ئەسڵەن، ئینسان دەرس بخوێنێ خەیری ئەو دەرسە ئەگاتە کەسێکی تر؟ یا ئێستا تۆ بڕۆی کتێبێك بخوێنیتەوە، تەماشای

بکەیت و ماناکەی باش حاڵی ببیت، بە یەکێکی تر چی؟ منداڵێك خەریکە دەرس ئەخوێنێ، سودەکەی ئەگاتە کەسێکی تر؟!بێگومان نەخێر، هەر بۆ شەخسی خۆیەتی. جا ئەگەر حاڵی بوو بچێ باسی بکات بۆ کەسێکی تر و حاڵی بکات، ئەویش بەمردوو حاڵی ناکرێت و بەزیندوویی حاڵی ئەبێ. کاکە گیان نوێژ یا ڕۆژوو یا قورئان خوێندن فائیدەکەی بەخۆی ئەگات، هەر وەکو ئەوەی دەرسێك ئەخوێنێ، یان کاتێ نوێژێك ئەکات، یان ڕۆژوییەك ئەگرێ ڕۆحی خۆی پێ پاك ئەکاتەوە، چۆن ئەکرێ ئەو فائیدەیە لە خۆی بستێنێتەوە و بیداتە یەکێکی دی و ئیمکانی نیە.

- قورئانیش ناچێ؟

- قورئانیش، زۆر ئیشتباهە گیانەکەم، زۆر گوناهە ئەسڵەن ئەغلەب ئەگەر حەسەناتێکی ماڵی ئەکەن وەختێ بیانو ئەگرن لەو تەرەفە ئەگرن و ئەڵێن قورئانێ بخوێنە بۆ مردووەکەمان، خەیری ماڵەکەشیان ئەچێ، ئیحسان و کۆمەکە ماڵیەکەشیان ئەچێ، لە قورئاندا زۆر بەحس کراوە لەسەر ئەوە کە ئینسان وەختێ ئیحسان ئەکا لە شتێ، ئیحسان بکات کە خۆشەویستە بەلایەوە، چاوەڕوانی جەزایەکی لەو تەرەفە نەبێت، پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم) دەفەرمێ، ئەگەر ئیحسان ئەکەی بە کابرایەك چاوەڕوانی ئەوەت هەبێ بڵێ سوپاست ئەکەم، یان چاوەڕوانی ئەوەت هەبێ دوعایەکی خێرت بۆ بکات، ئیحسانەکەت ئەفەوتێ، چونکە مامەڵەت کردووە، پوڵت داوە بە تەشەکور، یان پوڵت داوە بە دوعای خێر. ئەفەرمێ ئەگەر پوڵێك بدەی بۆ ئەوەی دوعای خێرت بۆ بکات، تۆش دوعای خەیری بۆ بکەوە، بۆ ئەوەی نەبێت بە مامەڵە، پوڵەکەت بە

دوعاكە نەچێت. وەختێ پولێ ئەدەیت بە ئیحسانێك هەژار و کەمئەندامێك، ئەگەر هیچ زەحمەتێکی بۆ دروست نەکەی، هەتا چاوەڕوانی تەشەکورێك نەبێ و مەنزورێکت نەبێ و باست بکا لەملاو لەولا، ئەوە بەڵێ خەیرە، بەلاّم ئەگەر وتت ئا دوعایەکی خەیرم بۆ بکە، یان سوپاسی کرد، یا چاوەڕوان بیت لێرە و لەوێ باست بکا، باست بکا و بڵێ فلاّنە کەس پولّی بە مندا، یا بلێی سورەتێ قورئان بخوێنە بۆم یان بۆ مردووەکەم یا ڕۆژێ ڕۆژوو بگرە یا دوو ڕکات نوێژ بکە، بەمە خەیری هەموو پولّەکەت لە کیس چوو ...

- قوربان ئێمە کاتێ مردوویەکمان ئەمرێ کۆدەبینەوە و قورئانی لەسەر ئەخوێنین!

- کارێکی یەکجار باشە بۆ خۆتان، عیبادەتێکە ئەنجامی ئەدەن، بەلاّم زۆر ئیشتباهە ئەگەر چاوەڕێ بیت ئەجرەکەی بۆ یەکێکی تر بێت، چونکە زۆر جار هەیە مرۆڤ قورئان ئەخوێنێ و نوێژ ئەکات یا ڕۆژوو ئەگرێ و هیچ ئەجرێکیشی نیە، بە دڵ نایخوێنێ هەروا سەرپێییانە وەك بێگارێك ئەنجامی ئەدا، یا ڕوگیر ئەبێت لەخەڵك، ئەوە هیچ سەوابێکی نیە نەبۆ تۆ نەبۆ هیچ کەسێکی تر، وەختێ بەدڵ خەریك بی و قورئانەکە بخوێنی ئەو وەختەیە فائیدەیەك ئەنیشێتە دڵی تۆوە، ئەو وەختەیە دڵی تۆ گەرم ئەبێ، ئەو وەختە بەو جۆرە ئەبی کە بە قسەی قورئان ئەکەیت و لە قورئان لانادەی، فائیدەکەی ئەوەیە کە عیشق و عەلاقەت بە قورئانەکە زیاد ئەبێ، پێت خۆشە قورئان چی وتووە وا بکەی و چی وتووە مەیکە نەیکەی ئەوە بەرەکەتەکەیەتی، ئەو وەختە بە خۆت ئەگات ئەو بەرەکەتە. دەی فەرموو ئەو فائیدە چۆن ئەدەیتە کەسێکی تر ئیتر چ

مردوو بێت چ زیندوو، بەڕاستی هەڵەیە مامەڵە ناکرێ بە عیبادەت، ئەگەر کەسێ دەستکورت و هەژار و حافزە، بۆ ئەوەی ئیحسانی پێ بکەن و ئیسقاتێك ئەکەن بۆ مردوو ١٠٠ تمەن و ٢٠٠ تمەن بیدەنێ بە خۆڕایی، نە ئەوەی تەکلیفی بۆ دروست بکەن بڵێی قورئان بخوێنە یان نوێژ بکە یان ڕۆژوویەك بگرە یا لاالەالااللە بکە هیچ کام لەوانە نەبێ لەبەینا بەخۆرایی بیدەنێ ئیتر ئیسقاتە یا خەیرە یا هەرشتێکە جوان جێ ئەگرێ و خەیرێکی باشە، ئەگەر ڕیایی و خۆدەرخستن نەبێ و زەحمەتی بۆ دروست بکەی، ئیحسانی پوڵەکەشت چووە و هیچیشت دەست نەکەوتووە

- <u>حەج دروستە بۆ یەکێکی بکەی؟</u>

- ئەویش دروست نیە کاکە گیان، ئەویش هەر لەو ئیشتباهاتەیە کەوا کراوە، دوو شت لەحەجدا هەیە، یەکێکیان ئەو تەکلیفەیە کە ئینسان ئەنجامی ئەدا و خەیرەکەی ئەگاتێ، ئەوە عیبادەتی شەخسیە، عیبادەتێکە ئینسان بۆ خۆی دەکا، یەکێکیشیان پولێکە کە خەرجی دەکا، ئەو مەسەلەی پولێ خەرج کردنە عیبادەتێکی ئیجتماعیە، ئەگەر کەسێ ماڵێکی لەسەر بێت کەسێکی تر ئەتوانێ بۆی ئەنجام بدا، ماڵەکە بداتەوە لە جیاتی ئەو، ئەغڵەب ئیشتبایان کردووە پێیان وابووە حەج عیبادەتە ماڵیەکەیە نەك عیبادەتە شەخسیەکە، ئا لەبەر ئەوەیە لێیان شێواوە و پێیان وابووە دروستە، چونکە ئەگەر من زەکاتێکم لەسەر بێت زیندوو بم یا مردوو بم دروستە تۆ لە جیاتی من بیدەی، یا قەرزی کەسێکم لەسەر بێت چ زیندوو بم چ مردوو بم، ئەتۆ ئەتوانی لە جیاتی من ئەو قەرزە بدەیەوە، هەروا هەر حەقێك کەسێکی تر ئەتوانێ بیداتەوە بەو شەرتە

ماڵی بێت بیداتەوە لە جیاتی ئەو کەسە ئیتر چ زیندوو بێت چ مردوو، ئەوە لەبەر چیە؟ لەبەر ئەوەی فائیدەیەکی گەورەی ئەو شتە ماڵیانە خزمەتە بە خەڵك. ئەگەر کابرا خۆی ئەنجامی نەداوە و بەرەکەتەکەی پێنەگەیشتووە و یا زیندوو یا مردوو دەسەلاٌتی ئەوەی نەماوە ئەنجامی بدات، تا وەختی خۆی کەمتەرخەم بوو هەر نەیکرد ئەوە خۆی زەرەری کرد، بەلاٌم با لانیکەم ئەو زەرەرەی بگەڕێتەوە، چیە؟! ئەوە خزمەتێکە کە بە خەڵك ئەکرێ، ئاخر عیبادەتی ماڵی دوو فائیدەی هەیە:

یەك ئەو فائیدەیان وەك نوێژ و ڕۆژوو کە دەستگیری کابرا ئەبێ کە عیبادەتەکە ئەکا فێری ئەوە ئەبێت لە ماڵی خۆی خەیر بکات بۆ خزمەتی خەڵك ئەوە فائیدەکەیە بۆ خۆی.

بارێکی تریشی هەیە کە کۆمەکی خەڵکە بەیەکتر و خۆشبونی ژیانی خەڵکە.

لە عیبادەتی ماڵیدا، ئەو بارەی زۆر گرنگە کە خزمەتە بەیەکتر، لەبەر ئەوە شەرعەن ئیجازەی ئەوە دراوە کە کەسێك لە جیاتی کەسێکی تر عیبادەتی ماڵی ئەنجام بدات. پێیان وابووە حەج عیبادەتە ماڵیەکەی موهیممە ئەمما وانیە ئەوە ئیشتباهە، لەبەر ئەوە بووە کە پێیان وابووە لە حەجدا عیبادەتە ماڵیەکە گرنگە، وەك زەکاتەکە یان قەرز، چونکە کەسێك قەرزێك یا زەکاتێکی بەسەرەوە بێت کەسێکی تر ئەتوانێ لە جیاتی ئەو بیدات، پێیان وابووە حەجیش پولێ خەرج کردنەکەی گرنگە، لە حاڵێکدا وانیە، ئینسان هەیە ئەتوانێ قرانێك خەرج نەکا بەکرێکاری بکەوێتە ڕێ، حەجی خۆی ئەنجام بدا، چوار پێنج ڕۆژ لەوێ بێ و پاشان ڕۆژێ کرێکاری بکات و قرانێك خەرج نەکا، ئەکرێ بۆ ئینسان. هەربۆیە

عیبادەتە ماڵیەکەی هیچ نیە، ئەگەر وابێ هەر ئەمێنێتەوە عیبادەتە بەدەنیەکەی و ئەو گرنگە، عیبادەتە بەدەنیەکەیش ئەوەیە ئەو مەراسیمە ئەنجام ئەدا ئەگەر بەدڵ و بەسەفا و سەمیمیەتەوە بوو، بەو تەرتیبە بوو کە شەریعەتی ئیسلام دیاریکردووە، کە سەرەتا تۆبەیەکی کامڵ بکات، شەرتی تۆبەیش ئەوەیە کە بەدڵ هەڵکەن بێ لە گوناھ و نەگەڕێتەوە بەلای گوناهدا، وە بڕیار بدات هەرچی حەقێکی خەڵکی بەسەرەوەیە قەرەبوی بکاتەوە، ئەگەر تۆبەیەکی ئاوا بکات و بگەڕێتەوە و بڕوا بۆ حەج بەهرەیەکی زۆر وەرئەگرێ بۆ خۆی. حەج ئەو لایەنەیە بەتەنها، لایەنی عیبادەتە بەدەنیەکە کە فائیدەی بە شەخسی خۆی ئەگا، عیبادەتە ماڵیەکەی شتێك نیە و هیچ ئەهمیەتێکی نیە، چونکە هەر عیبادەتە بەدەنیەکەیە و ماڵیەکە هیچ نیە، هەروەکو نوێژ و ڕۆژووی لێدێت و وەکو قورئان خوێندنی لێدێت و وەك دەرس خوێندنی لێدێت، کە ئیسفادە بە خودی کابرا ئەگات، نە بەخەڵك، ئەو لایەنەی ئیسفادە بە خەڵکی تیا نیە، لە لایەنێکەوە ئەگەر ئیستفادەی بەخەڵك تیا بوو، بەڵێ با ئیستفادە بە خەڵکەکەی با هەر ببێ، بەلاّم خۆ لە حەجدا هیچ نیە دەمێنێتەوە.

کابرایەك کەسێکی مردووە و خۆشیدەوێ، پێی خۆشە پولێکی بۆ خەرج بکات بەناوی حەجەوە، هەروا کە وتمان ئەگەر ئەو پولەی بۆ خەرج بکات بە ئیحسان هیچ منەت و زەحمەتێ بۆ کەس دروست نەکا زۆر چاکە، کۆمەکە ئیجتماعیەکەی هەیە بەلاّم ئەگەر ئەو ٥هەزار تمەنە یا ١٠هەزار تمەنە خەرج بکا و لەبەرامبەرەوە چاوەڕوانی ئەوەی ببێ کۆمەکی بکرێ و

حەجێکی بۆ ئەنجام بدریێ عیبادەتەکەی ئەفەوتێ، واتە بەمجۆرە کابرا پوڵ ئەدا بەیەکێ، ئەڵێ بچۆ حەجم بۆ ئەنجام بدە، یان بەیەکێ بڵێ حەجەکەم بۆ ئەنجام بدا، ئیحسانی پوڵەکەی ئەفەوتێ، چونکە زەحمەت دروست ئەکات، بەڵام ئەو کابرا چی بکات؟! بێنێ ئەو پارە و پوڵە چەندە ٥هەزارە یا ١٠هەزارە هەرچەنێکە ئەوە بکاتە ئیحسان زۆر لەوە چاکترە بەیەکێ بڵێ حەجێکم بۆ ئەنجام بدە، خۆی لە ئەساسەوە نە خودا نە پێغەمبەر وایان نەفەرمووە، بێتە سەر ئەو قاعیدە کە ئەغڵەبی ئەوەیان بەلاوە پەسەند زانیوە کە عیبادەتەماڵیەکەی موهیممە، ئەگەر وابێت بەڵێ دروستە کەسێکی تر ئەنجامی بدا ئیتر ئەو کەسە چ زیندوو بێت چ مردوو، بۆ عیبادەتی ماڵی وایە، وەلی بۆ عیبادەتی شەخسی یان بەدەنی کەسێك ناتوانێ لە جیاتی کەسێکی تر ئەنجامی بدا، لەباسی حەجدا پێیان وابووە عیبادەتە ماڵیەکەی گرنگترە تا عیبادەتە شەخسیەکەی، بەڵام ئیشتباهە عیبادەتە ماڵیەکەی هیچ نیە، ئەوانەی پێیان وایە عیبادەتی شەخسی کەسێکی تر ئەتوانێ بیکات، ئیتر نوێژ بێت یا ڕۆژوو یا حەج زۆر ئیشتبایان کردووە، چونکە ئێمە شوێنکەوتەی خوا و پێغەمبەرین، ئەوانیش بەهیچ جۆرێ شتی وایان نەفەرمووە، وە تەواوی ئەو فەرمودانەی لەو بارەشەوە وتراون زەعیفن، چونکە پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم) دەفەرمێ هەر عیبارەتێکتان لە منەوە بیست ئەگەر لەگەڵ قورئاندا جۆر نەبوو بی کێشن بەدیواردا! قورئان وا نافەرمێ قورئان ئەفەرمێ: "هەرکەسێك ئەوە وا ئەنجامی ئەدا بۆ خۆی ئەوەی لەگەڵ حیساب ئەکرێ". عەمەلی کەسێکی تر بە کاری کەسێکی تر نایەت، گوناهی کەسێك پێی کەسێکی تر ناگرێ، عیبادەتی کەسێکی تریش

فائیدەی بۆ کەسێکی تر نیە، تەنها فائیدەی ماڵی ئەتوانرێ کەسێکی تر لە جێی یەکێکی تر ئەنجامی بدات، چونکە فائیدەی ماڵی دو لایەنی هەیە، لایەنێکیان ئەوەیە کە فائیدە بە کابرا ئەگەیەنێ، کە قودرەتی پێ پەیا ئەکات و عادەت بەوە ئەکات کە هاوکاری خەڵك بکات، وە نزیکتر ئەبێ بە خوا و دڵی سەفای زیاتر پەیا ئەکات، لایەنێکی تریشی سود گەیاندنە بەخەڵك، لە فائیدە ماڵیەکەیا ئەوە کە ئەبێ کابرا خۆی ئەنجامی بدات خۆ بە ئەو ناگات، بەلاّم فائیدە ئیجتماعیەکەی هەیە، بەلاّم لە نوێژدا یا ڕۆژودا یا لە حەجدا یا لە قورئان خوێندنا، غەیری ئەو فائیدە لە ئینسان خۆی دەگات، فائیدەیەکی ئیجتماعی تێدا نیە.

- <u>فاتیحە بۆ مردوو ئەڕوات؟</u>

- قوربان من فاتیحە ئەخوێنم کاتێ بەلای گۆڕستانێکا ئەڕۆم!

- ئەوەش بیدعەتێکە، چونکە کاتێ کەسێ سورەتی فاتیحە ئەخوێنێ ئەبێ بۆ خۆی بیخوێنێ، ئەی بۆ ئەمە داهێنراوە، بیدعەتێکی جوانە و نەبووە لەسەردەمی پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم) یا لەزەمانی هاوەلاّندا نەبووە، بەلاّم دواتر داهێنراوە، بۆ داهێنراوە؟ لەگەڵ ئێستا ڕەنگە لای هەموتان هەبێ کە ئەغڵەب کاتێ دەچنە سەرەخۆشی قەدیم بانگیان هەڵئەدا و گریان و شینیان ئەکرد، خەڵك لە جیاتی ئەوەی دڵخۆش ببن ئەکەوتنەوە گریان، لەبەر ئەوە ئەو ڕەسمیاتە ناشەرعیە لەبەین بچێ، وتیان برا لەوەختێ کاتێ دەچنە سەرەخۆشی بۆ ماڵێ، لەجیاتی ئەوە فاتیحەیەك دادەن. کارێکی زۆر چاکە بە عیبادەتەوە ئەڕوا سەرەخۆشی ئەکات، فاتیحەیە چیە یانی سورەیەکی قورئان، دەنا هەر سورەیەکی ترت

لەبەرە ئەوە بخوێنە، بۆیە ئەوەیان داناوە چونکە هەموو کەسێك لەبەریەتی، دەنا سورەی فاتیحە مەخوێنە، سورەتی ناس بخوێنە، سورەتی ئیخلاص بخوێنە، هەر سورەیەك، گرنگ ئەوەیە کە عیبادەتێك بکەی. وەختێك عیبادەتێك ئەکەی، ئەوەڵەن ئەو ڕێوڕەسمە ناشەرعیە نیە کە بە کەلیماتی ناشوکری و خراپی و بەگریان و شیوەنەوە بچیتە نێو مەجلیسی تەعزیەکە، بەڵکە بە عیبادەتەوە بچی، دووەم وەختێ عیبادەتەکەت بەدڵ بێ، ئەو وەختە دوعایەکی خێر ئەکەی بۆ مردوو یا ساحێب مردوو، ئا لەبەر ئەوە داهێنراوە، نەك ئەمە من ئەم فاتیحە بۆ مردووەکە بخوێنم، یا بۆ زیندووەکەی بخوێنم، خۆ لە فەرمودەی پێغەمبەردا(صلی الله علیە والە وسلم) ئەوەی کە ئینسانێ ئەچێتە مەجلیسێ بۆ سەرەخۆشی دوعای خێر بۆ مردوو و زیندوو ئەکات، نەك هەر بۆ مردووەکە، ئەگەر وابێت فاتیحەکە ئەگات بە زیندووەکانیش، چونکە کە دوعاکە بۆ هەردوکیانە کەواتە فاتیحەکەش بۆ هەردوکیانە، لەکاتێکدا ئەسڵەن لەگەڵ ئسوڵی دیندا نایەتەوە موتڵەقا، نە فاتیحە نە هەر ئایەتێکی قورئان نە نوێژ نە ڕۆژوو، هەمووی بۆ زیندووە نە مردوو، چونکە ئەگەر کەسێك چاك بێت، بیهێنی بیشی سوتێنی هەر چاکە، ئەگەریش خراپ بێت با بێیت وەکو فیرعەونەکانی میسر مۆمیای بکەی و بیهێڵیتەوە تا ١٠٠٠٠٠ساڵ بەدەوروبەریا خەڵك دابنێ تا ١٠٠هەزار ساڵ قورئانی بەسەرا بخوێنن، ڕوحی ئەو لەعەزابایە و هیچ کاریگەریەکی نیە بۆی، بیهێنە پێش چاوی خۆت کەسێکی تاوان بار بنێرە قەبر خەتەرناکی دوژمنی دین، مۆمیایی بکە و ١٠٠ قورئان خوێنی دەنگخۆش دامەزرێنە ٢ساڵ ٥ساڵ ١٠ساڵ هەر قورئانی بەسەرا بخوێنن، ئا ئەوەندە سودی بۆ حاڵی ئەو نیە، ئەگەریش

چاکبوبێت لەمەیدانی شەڕا لەت و پەت ببێ، یا دەعبا بیخوا و لەت و پەتی بکا، هەر پارچەیەکی ئاژەڵێ بیبات، یا بکەوێتە ناو ئاگرەوە بسوتێ، بکەوێتە دەریایەکەوە نقوم ببێ، خۆ کەس ناتوانێ دانیشێ بەلایەوە قورئانێ یا تەڵقینێ بخوێنێ، ئائەوەندە زەرەر ناکا، زەرەر یا قازانجی ئینسان، بەوەی وا لەحاڵی حەیاتی خۆیدا ئەنجامی دابێت، تازە دوای ئەوەی مرد، هیچ ئیتر بەکاری نایەت. ئاسانە مردن، وەختێ دەکەوێتە گیانکێشان ئا لەو وەختەیشدا تازە هیچ شتێ بەکاری نایەت، ئەمانە چیە؟ ئەوەی کە پێی بڵێی لاالەالاالله ئەوە وەزائیفی ئێمەیە لەگەڵ یەکتر، نە ئەوەی وەزیفەی ئێمە بێت بە مردوو، ئێمە هیچ فائیدەیەك ناتوانین بە ئەو بگەیەنین، ئەمەی کە دوعای بۆ بکەی یا لەگیان کێشاندا پێی بڵێی بڵێ لاالەالاالله ئەمە وەزیفەی موسڵمانە نیسبەت بەیەکتر، کە هەمیشە بەدەم یەکترەوە بن چ بۆ زیندوو چ بۆ مردوو دوعای لێخۆش بون هەیە، وەك لەفەرمودەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه واله وسلم)ئاماژەمان پێدا، نەك قورئانی بۆ بخوێنی و بۆی بنێری، نەك ڕۆژووی بۆ بگری و بۆی بنێری، هەروەکو ئەو فەرمودەیە کە دەرئەخات ئەمانە باتڵە و ئیسلامەتی شتێکی ترە و غەیری ئەمەیە وا لە کتێباندا نوسراوە.

من نوێژ بکەم یان ڕۆژوو بگرم یان قورئان بخوێنم و هەدیەی بکەم ئەوە کەی دوعای خێرە؟ ئەوەی کە ئێمە لە قورئان حاڵیمان ئەبێ عیبارەتە لە دوعای خێر بۆ یەکترکردن،،سەیر ئەکەی لە نوێژدا لە تەحیاتدا، لە هەموو عیبادەتێکی تردا دوعای خێرمان بۆ یەکتر هەیە، بۆ مردوو بۆ زیندوو دوعای خێرمان بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) هەیە

صەڵاوات دەدەین ئەوە دوعای خێرە، ئەمریشەو دەستوریشە. دوعای خێر واجبە لەسەرمان بۆ یەکتری، بۆچی؟ چونکە وەزیفەی ئینسانی موسڵمان ئەوەیە خێرخوا بێت بۆ تەواوی موسڵمانان، بۆ مردوو بۆ زیندوو. وەزیفەی ئەوەیە موحیبەتی هەبێ، ،سادەترین ڕێگەی موحیبەت دوعای خێرە، ئەگەر ئینسان لە دوعایش درێغی بکات لەڕێگەی ترەوە چۆن حازرە بۆ یارمەتیدان و دڵسۆزی بۆ خەڵك؟ لەبەرئەوە تەمرینی ئێمە بۆ خەڵك خۆشویستن عیبارەتە بۆ دوعای خێر بۆ مردوو بۆ زیندوو، ئەوە دەستوری قورئانە.

خێرخوازی بۆ یەکتر بەهەرجۆرێك کە یەکێکیان دوعای خێرکردنە ئەمە جۆریکیانە، نەك ئەوەی هەمووی هەر ئەمە بێت بۆ مردوو تەنها دوعای خێرەکە هەیە، بەس بۆ زیندوو جۆری تر هەیە ئەڕۆم دەرسی پێ ئەڵێم، ئەڕۆم فێری قورئانی ئەکەم، ئەڕۆم ئەگەر ماڵەکەی ڕوخاوە دیوارەکەی بۆ چاك دەکەمەوە، بەڵام بۆ مردوو هیچ نیە، جگە لە دوعای خێرکردن، هەمومان دەزانین دوعاو لێخۆشبون چیە؟ کەی دوعاو لێخۆشبون عیبارەتە بۆ ئەوەی قورئان بخوێنم و بڵێم پێشکەش بە ئەو! چونکە تۆ تەنها یەکجار قورئانت خوێندووە و یەکجار پاداشتی هەیە، تۆ دەڵێی پاداشتەکەی خۆم بۆخۆم، ئەمە شتێکە هەر نیە، دەیبەخشیت یەکدانە پاداشتی هەیە کە ڕایدەگری بۆخۆت، چونکە لەیەکدانە پاداشت بەولاوە هیچی نیە چی دەبەخشیت؟ بۆیە هیچی بۆ ناچێت، هەرکەسێك چاکە یان خراپە دەکات، هەموی بۆ نەفسی خۆیەتی، ئەگەر تۆ قورئان دەخوێنی یان نوێژدەکەیت ئەگەر بە پاکی بێت سودی هەیە، سودەکەی چییە؟ ئەوەیە کە ڕۆحی خۆتی پێ پاك دەکەیتەوە، ئەوەیە کە پەیوەندیت بە

دین زیاتر دەبێت، ئەم سودە هەر یەکێکە! دوان و سیان نیە، هەر ئەوەندەیە بە خۆت دەگات ئیمکان نیە ئەو سودەی خۆت ببەخشی بە یەکێکی تر. هەروەك ئەوەیە کە دەرسێك دەخوێنی و سودی لێ دەبینی ناتوانی ئەم سودە ببەخشیتە کەسێکی تر، چونکە بەس خۆت حاڵیت بووە عیبادەتی شەخسیش هەموی وایە، دوەمیش یەك دانەیە سودەکە ئەوەیە کە خۆت حاڵیت بوو، چلۆن ئەڵێیت وەك و ئەم سودە بەمن گەیشتوە ئەینێرم بۆ ئەوانی تریش؟!! شتی وا ئەسڵەن نییە.

- بەڵام ئەمە لوتفێکە خودا لەگەڵ بەندەی دەکات، کە ئەو مردوەش بەشدار بکات لەو خێرەی تۆ!

- نەخێر ئەمە شتیکی زیادییە، نە لە قورئاندا هەیە و نە لە سونەتیشدا هەیە، هەتا عیبارەتی حەدیسەکە موخالیفی ئەمەیە هەدیەی زیندوو بۆ مردوو، دوعاو تەڵەبی لێخۆشبونە، ئەوە دوعا نیە. من ڕۆژووەکەم پێشکەش بکەم بە کەسێکی تر، ئەمە شتێکی باتڵە، ئەمە بیدعەتێکی سەیئەیە، بیدعەت جۆر جۆرە، ئەوانەی وا عەرزم کردن عالمێك دەیلێیت جۆرە لەگەل کیتاب و سوننەت ئەوەمان قبوڵە، هەیە جۆر نیە ئەوە مەردودە و جێگای قبولْ نیە، وەك ئەمە (خودایە سەوادی ئەم فاتیحەی من پێشکەش بکە بە فڵان ) فەرقی نیە فاتیحەش هەروەك ئەوەیە کە ڕۆژی ڕۆژوو دەگریت، وەك ئەوەیە نوێژ دەکەیت بڵێی خودایە وەك و سەوابی ئەم نوێژەی من ئەم ڕۆژوەی من پێشکەش بە فڵان کەسی بکە، خۆ ئەگەر ڕۆژێك ڕۆژوو بگری تا ئێوارە سەوابی زۆرترە لەوەی بە خێرایی ٢سورە فاتیحە ئەخوێنیت، بەڵکو خێرا تەواو بێت، ئەمە هیچ

سەوابێکی نیە ئەم نەوعە فاتیحانە وا خەڵکی دەیخوێنێت، هیچ سودێکی نیە نە بۆخۆی نە بۆ غەیری خۆی، ئەگەر بەدڵیش خوێندبێتی خۆ ڕۆژوویەك لە بەیانی تا ئێوارە دەیگرێت سەوابی نیە، ئێوارە چۆن دەتوانی بڵێیت خودایە وەك سەوابی ئەم ڕۆژوەی من بنێرە بۆ پێنج سەد ملیارد ئومەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم)، ئەوە کەی دوعایە، ئەوە کەی مەعنای هەیە، ئەمە شتێکە لەڕوی فیکری خۆیانەوە زیادیان کردوە لەسەر ئیسلام، چونکە درۆ زۆر کراوە بەزمانی پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه واله وسلم)، ئەوانەی کە ڕاستن ئەزانن شتێکی خۆرایی و بێ مانایە زیادکراوە، ئەگەر لازم بوایە و چاك بوایە قورئان دەیفەرموو.

- <u>من بڕوام بە کەعبە هەیەو ئەبێت ڕوی تێبکەم، بەڵام بۆچی کەعبە دانراوە بە قیبلەو ئەبێ حەتمەن ڕوی تێبکرێت؟</u>

- ئینسان جەستەی هەیەو ڕۆحیشی هەیە، وەختێك کارێك ئەنجام ئەدات بۆ ڕۆحی خۆی ئەنجامی ئەدات، دەبێ جەستەی لەگەڵی هاوکاری بکات، ئەگەر کابرا بۆ نمونە خەریکە دەرس ئەخوێنێت خەریکە مەشق ئەنوسێت بۆئەوەیە بەهرەیەك بە ڕۆحی بگات، حاڵیبون بۆ ڕۆحە خۆ بۆ جەستە نیە، نەقەدو باڵای پێ زیاد دەبێ نە جوان دەبێ، هیچ پەیوەندیەکی بەوانەوە نیە! نوێژێك دەکا ڕۆژویەك ئەخوێنێت، ئەمانە هەمووی عیبادەتێکی ڕۆحین، سودەکەی بە ڕۆحی ئینسان دەگات نەك جەستەی، بەلاٌم ئەبێ جەستەیش کەمێ هاوکاری بکات، نەك جەستەی بەرەو بارێك و ڕۆحی بەرەو بارێك، قورئان دەفەرمێ :﴿ وَلِلّٰهِ الْمَشْرِقُ

وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ إِنَّ اللّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ[1]﴾ هەروەكو ئەو پرسیارەی وا بە بیری هەموو کەسێکدا دێت، ڕۆژهەلاًت و ڕۆژئاوا هەموو لایەك هەر پەیوەستە بە خودا، بەرەو هەرلایەکیش بڕوانن هەر ڕوتان کردۆتە خودا، ئەسڵی باسەکە ئەوە نیە خودا لە جیهەتێکەوە مەترەح بێت، نا! بەڵکو لەبەر شتێکی ترە کە هەتا لەحالًی پێغەمبەردا(صلی الله علیه واله وسلم) ڕوندەکرێتەوە و خودا ئیشارەتی پێ دەکات ﴿قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ[2]﴾ ئینسان بەڵێ کاتێ نوێژدەکات بۆ پەروەردگاری خۆی دەیکات، بەلاًم جەستەیش هەیە لەگەڵی، خۆ ناکرێت ڕۆح خەریکی نوێژ کردن بێت و جەستەش مەسەلەن خەریکی یاری کردن بێت، ئەبێ جەستەیش هاوکاری بکات، جەستە ڕوگەی هەیە، ڕۆح ڕوگەی نیە، ڕۆح فەرق ناکات دوور و نزیك، درەنگ و زوو، ئەملاولا ،هەر یەکێکە بۆی، بەلاًم جەستە چی؟ فەرموو من ئێستا کە خەریکم قسە دەکەم بۆ ڕۆحی ئێوەیە، بەلاًم بە جەستەش دەڕوانن، جا ئینجا سودەکەی تەواو دەبێت، دەنا ئەگەر جەستەت هاوکاری نەکات، لە گوێتەوە ڕێك ناگات کە ڕۆحت بەهرەی لێ ببات، ئائەوە کە ئینسان بەجارێك ڕوو دەکاتە کەسێك بۆئەوەی حالًی ببێت، نیشانەی ئەوەیە کە دەبێ جەستەیش هاوکاری بکات، قورئان دەفەرمێ ئەوە کەعبەمان دیاری کرد بۆئەوەی ڕووی تێبکەن، نەك بۆ ئەوەی سوجدەی بۆ ببەن، سوجدە بۆ کەعبە نابرێت، بۆ خودا دەبرێت،

---

[1] سورەتی البقرة/ ئایەتی ١١٥.

[2] سورەتی البقرة/ ئایەتی ١٤٤.

بەڵام جەستە پێویستی هەیە بە ڕوگەیەك بۆئەوەی هەماهەنگ بێت و بگونجێت لەگەڵ ڕۆحدا، لەبەرئەوە کەعبە دیاری کراوە کە ئینسان ڕووی تێبکات.

دەمێنێتەوە سەر ئەوەی سودی ئەمە چیە؟ دوو سودی تیایە کە ڕوونی بکەینەوە، یەکێکیان سودی تاکە کەسیە، هەر ئینسانێك لەو کاتەدا کە خەریکە عیبادەتی ڕۆحی دەکات، جەستەیشی هاوکارە لەگەڵیدا، جەستە و ڕۆح ئەکەوێتە یەك، دووەمیش ئەوەیە کە تەواوی خەڵکیش دەکەونە یەك و یەك ڕەنگ دەبن، نەك ئەوەی هەر کەسێك و بەجۆرێك و بەرەو بارێك هەموو کەس بەیەك جۆر و بەیەك بەرنامە کە هەماهەنگ کردنی جەستە لەگەڵ ڕۆحە، هەمووکەس بەرەو یەك ڕوگە لەتەواوی جیهاندا، سەیردەکەی وەك دائیرەیەك وایە بەدەوری کەعبەدا کە ئەمەش نهێنیەکی گەورەی تێدایە، ئەسڵەن نەزمی ئەم جیهانە لەسەر ئەو جوڵە دەورانیەدا دەگەڕێت، بەگشتی هەر ئەو نەزمەیە وا خودا بۆ ئینسانی دامەزراندووە بەرەولای کەعبە، ئەمەش ڕازێکە باسێکی دورودرێژی دەوێت، ئەمە ئەسڵی سودی ڕوگەو قیبلە دیاریکردنە کە بەشەر کاتێك خەیاڵیکی هەیە عیبادەتێك بکات و فائیدە بە ڕۆحی خۆی بگەیەنێت، جەستەشی ئەبێت هاوکاری لەگەڵ بکات، جەستەش ڕوگەیەکی دەوێت، جیهەتی بۆ دیاریکراوە، جەستە و ڕۆحی یەکدەگرێت، خەڵکیش هەموو یەکدەگرن بەرەو ئەو ڕوگەیە. بەلاَم ئەوەی کە بۆچی کەعبە دیاریکراوە لەتەواوی بەشەکانی گۆی زەویدا، ئەویش دەلیلی زۆری هەیە، سادەترین بەڵگەی ئەوەیە کە قورئان بۆ ئێمەی دیاریدەکات کە یەکەمین بینا بووە لە مێژوی مرۆڤایەتیدا دروستکراوە بۆ عیبادەتی خەڵك و پەرستگای تەواوی

خەڵك بووە، نەكماڵێك دروستكرابێت كە یەك كەس بڕوات تیایدا بژیت، نا! ماڵێك بووە بۆ تەواوی خەڵك دروستكراوە، كە بڕۆن بۆ ئەوێ عیبادەت بكەن، یانی بەرلەوە مرۆڤ هێشتا ماڵی دروست نەكردووە، هەر لە دارستان و ئەشكەوتدا ژیاوە، یەكەمین جار كە مرۆڤ گەیشتە دەورانی تازەی ژیان كە دەستكاری زەمین بكات و ئیشی تیابكات، ئەوەبوو كە ئەم بینایەی دروستكرد. كەواتە قۆناغی تازەی ژیانی بەشەرو تەمەدونی تازەی ئینسانیەت لە دروستكردنی كەعبەوە دەست پێدەكات، ئەگەر وابێت كەعبە ڕەمزی ژیان و مێژوی شارستانی مرۆڤە، بەگشتی یەكەمین پەرستگایە، كەواتە ئەوەڵ و ئاخیری ژیانی مرۆڤ، هەموی پەیوەندی لەگەڵ یەك پەیدا دەكات، لەبەر ئەو دوو لایەنەی كە وتم، لەناو تەواوی گۆی زەویدا خوای گەورە كەعبەی دیاری كردوە[١].

---

[١] لێرەدا كەسێك موداخەلە ئەكات و چەند ڕونكردنەوەیەك ئەدات لەسەر قسەكانی مامۆستا بەباشمان زانی لێرەدا وتەكانی بنوسینەوە، كە دەڵێ: ئوسوڵی تەوحید پێنجە (یەك خودامان هەبێت، پێغەمبەرمان یەك بێت، قیبلەمان یەك بێت،دەستورو شەریعەتمان یەك بێت، كیتاب كە قورئانە یەك بێت) وە قیبلەش یەكێكە لەو پێنج دانە، مەعنای یەك دینی ئەوەیە لەو پێنج شتەدا یەك بین، ئەگەر هات و لەیەكێك لەو پێنج شتەدا یەك نەبوبن، ئەوا ئەو میللەتە یەك دین نین، ئەگەر قیبلەی جیاوازیان هەبوایە میللەتی ئیسلام یەك میللەت نەدەبوون، خۆیان بەیەك میللەت ناناسێنن وە ئێمە ئەو سوجدەیە بۆ خودا دەبەین بۆ كەعبەی نابەین، خودا خۆ لەیەك جێگە نیە، لە هەموو جیگەیەك هەیە ئەبێت شوینێكی دیاریكراو هەبێت كە ڕوی تێبكەین، گەر هیچ شوێنیكی دیاریكراو نەبوایە ئەوا قیبلەی جیاجیا دەبوو نەزم و نیزام دەگۆڕا، خەڵك دەڵێت بۆچی ئەوێ دیاریكراوە؟ ئەوێ یەكەمین شوێنە

- **نوێژی مردوو، ئەگەر نەکرا، ئیتر ئیمام نەبوو یا نەگونجا، چی دەبێ؟**

- ئەگەر نەکرا و فەوتا، ئەوە قەرزێکە بەسەر خەڵکەوە، وەزیفەیەکە بۆ خەڵك، هەر وەختێك کەسێکی زانا پەیدا بوو بیکات، نەبوو ئەوە هیچ! زۆر حەق هەیە و نەدراوە و نەکراوە و فەوتاوە

- **ئەسڵی ئیحسان چیە؟**

- کۆمەڵێك خواردنیان نیە و ماڵ و دارابیان نیە، جێگەو ژیانیان خراپە، هەوڵبدەی ئەوانیش وەك ئەوانە ڕاییبوێرن کە هەیانە، ئەسڵی ئیحسان ئەوەیە. ئەو ئیحسانە وا لەدنیا بەڕێوە دەبرێت کە بەناوی ئیحسانەوە مەولودی دەکەن یان بەهەر جۆرێك کارێ دەکەن، تەنها کۆمەڵێکی دەوڵەمەند سودی لێ دەبینن، ئەوە ئیحسان نیە، ئەگەر فەقیرە چوار پێنج ماڵ فەقیر لە دێیەکا هەیە ئەنێرن ماڵی یەکێکیان تەنها پیاوەکانیان بانگ دەکەن، وە ژن و منداڵەکەی کە پێویسترە لە پیاوەکە هەر داخ و حەسرەت دەچێتە دڵیان لە ماڵەوە دەڵێن ئای توخوا بابم چووە ئێستا پڵاو دەخوات! ئەمانە ئیحسان نیە. ئیحسانە واقیعیەکە ئەوەیە ناوی قوربانی لێ ئەنێی، یا ناوی مەولودی ئەنێی، هەر ناوێك پێت خۆشە، کە سەیردەکەی چوار پێنج ماڵی فەقیر لە شوێنێکدا هەیە گەر جێگەیان نیە بۆیان بکرِی ماڵیان

---

دروستکراوە بۆ عیبادەت لەپێش حەزرەتی ئیبراهیم هەر بووە، حەزرەتی ئیبراهیم دروستی کردۆتەوە، مەبەست ئەوەیە دینی ئێمە دینێکی تازە نییە، هەمان دینی ئیبراهیمە کە حەزرەتی ڕەسول(ﷺ) تازەی کردوەتەوە، هەر لە ئادەمەوە تا خاتەم هەموو دینەکان یەکێکن، دینی ئێمە هەمان دینی ئیبراهیمە، هەر لەسەردەمی ئیبراهیمدا هەموان ڕویان کردۆتە ئەوێ و لەوێ کۆبونەتەوە و عیبادەتیان کردووە، ئەگەر وانەبوایە ڕوگەی جیاواز دروست ئەبوو، بەم هۆیەوەش دینەکە تێك دەچوو.

وێران بوە بۆیان چاك بكەیتەوە، خواردنیان نیە بۆیان ببەیت، جلیان نیە بۆیان دروستكەی، ئەسڵی ئیحسان ئەوەیە: یانی كارێك بكەی نەدارەكانیش وەك ئەوانەی هەیانە خۆشی ڕابوێرن لەهەر بارێكەوە بێت، ڕۆحی ئیحسان یانی ئەوە، حاچ ناوێك لەو ئیحسانە ئەنێیت گرنگ نیە، بەو جۆرەی وا باوە مەولودی دەكەن و خەڵك كۆدەكەنەوەو دەوڵەمەندو فەقیر دەعوەت دەكەن، ئەوە هیچ نیە! یان وەك ئەوەی لە ماڵە فەقیرەكەدا یەك نەفەریان بانگ دەكەن و ئەوانی تر داخو خەفەت دەخۆن، كاتێ كابرا دەگەڕێتەوە ماڵەوە، ژنی لێی دەپرسێت منالی لێی دەپرسێت چییان بوو لەو مەولودیەدا، ڕۆلە گیان خواردنەكەیان واو وا بوو هەموی داخ و حەسرەت ئەچێتە دڵی، زۆر هەن بەم نەوعە ئەمە چ ئیحسانێكە! نەوەڵڵا ئەو ٥٠٠ پوڵە یا هەر چەنێكە كە لەو مەولودیە سەرفی دەكەی بە پارە بێت یان بە خۆراك بێت، بیبە بۆ ئەو چەند ماڵە وا پێویستیانە، هەتا ئەگەر كەیفت لێیە چێشتیان بۆ دروستكەی بۆیان بنێرە، یان بە پارە چونكە خۆیان باشتر ئەزانن چیان پێویستە ئەوەیە خێری باش، جا بەناو باوكەوە ئەیكەی، بەناو دایكەوە ئەیكەیت، بەناو خۆتەوە دەیكەیت، گرنگ نیە، بەو جۆە مەیكە وا خەڵكی تر ئەیكات.

ڕەسمیاتی وڵاتی ئێمە ئەوەیە ئەگەر كابرا كەسێكی مرد، بەڕاستی ماڵی وێران دەبێت بەتەواوی تا چەند ڕۆژ لەم شارو لەم لادێوە میوانی دێت كۆڵەواری دەكەن بەحارێ ماڵوێرانی دەكەن، بەڵام بیستومە لە وڵاتی ئێوە برێك لەوە باشترە ماڵی دۆست و دراوسێكە شتێك دروست دەكەن و دەیهێننە مزگەوت، هێشتا ئەوەش با هەندێك لەوەی ئێمە باشترە، بەلاَم

دووره له ڕێکی. ڕێی شەرعی دین ئەوەیە وەختێك كەسێكی لێ ئەمرێت، دۆست و خزم و دراوسێی ئەو ماڵە مردوە دەعوەت بکەنە ماڵی خۆیان، بیگەڕێنن و ئەملاو لا تا سێ ڕۆژ یان ئەگەریش دەچنە ماڵەوە هەر له ماڵەکەی خۆیدا دانیشن، بەڵام ئیجازەی ئەوەی نەدەن خۆی هیلاك بکات، ئەوە شەرعییە. نەك ئەوەی كه خەڵك بێت بدات بەسەر خەڵکی دێیەکدا یان مل ماڵێکداو دەست بکات به نان خواردن، ئەم ڕەسمیاتەی ئێوه تا ڕادەیەك باشترە لەوەی ئێمە، كه خەرج ناکەوێتە سەر ماڵە مردوەکە ئەوەی باشترە، بەڵام لەلایەکیشەوە خراپە! خۆ زەماوەندی نەکردوه کابرا، مردویەکی لێ مردوە، سەرەخۆشی خۆشە، بەلاَم نەك وەك ئەم جۆرەی وا له کوردەواریدا باوە، لەم دێ و لەو دێوه هەموی بێت بۆ سەرەخۆشی، ئەمە هیچ نیە! جۆرە عادەتێکە، نەك سەرەخۆشی، بۆتە چاولێگەری! کابرا ئەڵێت ئەو دێیە كەسێکی مردووە ئەگەر ئێمە نەچین گەر ئێمەش كەسێکمان بمرێت نایەت، دەی با نەیەت! سەرەخۆشی ئەوەیە دۆستایەتی نزیکیەك له بەینا ببێت، ئەو کەسانەی وا تێکەڵیان هەیە لەگەڵ ماڵی مردوەکە، لەدەوری بن و ئارامی پێ ببەخشن تا سێ ڕۆژ لەڕوی ئیسلامەوە ئەمە ڕێپێدراوە، پیویست ناکا دێ بە دێ بڕۆی مەگەر ئەوەی كەسێکی زۆر نزیك بێت، نەك لەبەر عادەت. عادەت سەرەخۆشی نیە، موحیبەت و ڕەفاقەت دەبێتە سەرەخۆشی، ئەوە تۆزێ کەم بکەنەوە، جگە لەوەش کارێك بکەن ئەمڕۆ ئوتۆمبێل هەیە هاتوچۆ ئاسانە، ئەگەر پێویست بوو كەسێك خزم و دۆست بوو، چوو بۆ دێیەکی تر بۆ سەرەخۆشی، ئاوا بە کۆمەڵ نەچن، ئەوەشی وا ئەچێت با سەعاتێك بچێت و سەرەخۆشیەك بکاو هەستێت بێتەوه ئاوای لێ بکەن، دەبێتە شتێکی

ئیسلامی و جوان، ئەم سفرە ڕاخستنەتان نەبێت. ئەو سفرە ڕاخستنە خۆ ئەو عەیبەی تریشی هەیە وا لە مەولودیا وتم، ئەگەر کۆمەڵێك دەیخۆن، خۆ خێزان و ژن و منداڵەکەیان نایخۆن، ئەوەیشی تیایە. نەوەڵلاً وەرن وردە وردە بە ئیزنی خوا ئەو دابانە وا باون لە کوردەواریدا و شەریعەتی ئیسلام قبوڵی ناکات و خودا دەستوری نەداوە و پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم)دەستوری نەداوە لایبدەن.

- حیکمەت و مانای ئەم ئایەتە چیە؟ ﴿إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ[1]﴾

- با شتێکی سادە بڵێم، بەشەر پێویستی بە ماڵی دونیا هەیە تا ژیان بەڕێ بکات، چونکە بێ ماڵی دونیا ژیان بەڕێ ناچێت، هەرچەند ئەهلی زانست و ئیمان بێت، هەرچەند فیکری گەورە بێت، جەستەیەکیشی هەیەو پێویستی بە تەئمینی جسمەکەش هەیە، جا ئیتر ئەوە بەپێی هیممەتی خۆی کەوتووە، ئینسانی وا هەیە حەیوانێکە تەنها لەوەڕەکە موهیممە بۆی، ئیحتیاجە ماڵیەکە موهیممە بۆی، بەڵام ئینسانی ڕاستەقینە لایەنی ماڵی تەنها گۆشەیەکە، نەك ئەوەی ببێتە هەدەفێکی گەورەو گرنگ بۆی، گرنگ بۆ ئەو مەعنەویەتەکەیە، چاك بونەکەیە، خزمەت بە خەڵك کردنەکەیە، هەوڵی هیدایەت و ڕێنمایی خەڵکە ئەوە موهیمترە بۆ ئینسانی چاك ئەمما ئەویش بەهەرحاڵ هەر پێویستیەکی هەیە، ماڵی دونیای هەبێ و پێی بژی، خودای گەورە کۆمەڵێك شتی لەسەر ئەم زەویە داناوە، کە بۆتەواوی ئینسانە، بۆ ئەوەیە هەموی سودی لێ ببینن، نەك

[1] سورەتی الإسراء/ ئایەتی ٢٧.

کۆمەڵێك کەس، بەڵام بە ڕێگەی جیاوازی کارو کاسبی، جا حەڵال بێت یان حەرام ڕێگەی ڕاستی ئیسلامی ئەشێوێت. باری سەحیحی ئیسلامی ئەوەیە کە نەزمێکی داناوە خودای گەورە، هەمووکەس دێتە ئاستێکی مامناوەند، هەموو ژیانیان وەك یەکی لێدێت، ئەو نەزمە تێکدەچێت، سەیردەکەی هەندێکیان زۆریان دەبێ و هەندێکیان نایان بێت، ڕاستیەکەش ئەوەیە نابێ هەندێك نەیانبێت تا ئەوانی تر یەکجار زۆریان هەبێت، ئەگەر هەموو کەس هەیبێت بخوات ئیتر لای کۆمەڵێك کۆ نابێتەوە، ئەگەر وەزعێکی وا هاتە پێشەوە لای کەسانێك ماڵێکی زۆر کۆبویەوە، شەریعەتی ئیسلام ڕێگە نادات کە ئەوە بە ماڵی خۆیان بزانن، هەرجۆرێك ئارەزوی خۆیانە وا سودی لێ وەرگرن.

دوو جۆر سود هەیە ناشەرعیە یەکێکیان ئیسرافە، یەکێکیان کە لەوە خراپترە تەبزیرە. ئیسراف یانی چی؟ یانی زیادەڕەوی کردن لە خەرجدا، زیادەڕەویکردن بەپێی وەزعی کات و کۆمەڵگەکەی خۆی و وڵاتەکەی خۆی زیادەڕەوی بکات، یانی ئەوە کاتی وا هەیە ئەگەر ئینسان لە نان و دۆ زیاتر بخوات دەبێتە ئیسراف، کاتی وا هەیە ڕۆژی جارێك گۆشتیش بخوات نابێتە زیادەڕەوی، بە شوێن و وڵات کەوتوە، قانونی ئیسلام ئیسرافی مەنع کردووە، جا لەکاتێکدا دەسەڵاتێکی ئیسلامی نەبێت هەرکەس وەزیفەکە ئەکەوێتە پێی خۆی وەك باقی وەزائیفی تر، ئەگەر دەسەڵاتی ئیسلامی بێت حکومەتی ئیسلام موکەلەف ئەبێت ئیجرای ئەوانە بکات و ئاگای لێ بێت. ئیسراف ئەوەیە وا لەو سنورە کە هەموو کەس خەرج بکات زیاتری هەبێت، ئەمڕۆ قائیدەیەك هەیە لەدونیا کە سەرانە دەرەخەن مەعلوم دەبێت کە لەهەر جێگەیەك بژیت هەر ماڵێك چەنێکی دەکەوێت، هەر

سەرێك چەنێكی دەكەوێت ئەوەیە حیسابەكە، حەددی ناوەند یانی ئەوە لەم دێی تورجانە مەسەلەن ئەگەر حیسابی بكەیت ماڵێك مەسەلەن هەفتەی جارێك بتوانن گۆشت بخۆن یان پڵاو بخۆن و ماڵێكیش فەرشێكی هەزار تمەنیان هەبێت، سەیربكەیت هەموی دەتوانێت بەو جۆرە ڕایبوێرێت، ئەگەر لەوە لایدا دەبێتە ئیسراف و زیادەڕەوی. زیادەڕەوی واتە لە شتێكدا ئینسان پێویستی پێی هەیە، یانی لە خۆراكدا لە جلوبەرگدا لە فەرشدا لە شوێندا لەوانە لە حەددی ناوەڕاست لایدا دەبێتە ئیسراف، مەسەلەن بیناكەی زۆر بەتەرتیب دروست دەكاو ئەیڕازێنێتەوەو گلۆپی جۆراو جۆری بۆ دائەنێت و فەرشی گران بەها خۆراكی ڕەنگاو ڕەنگ، ئەوە دەبێتە ئیسراف، كەواتە ئیسراف یانی خەرجكردنێكە كە ئەسڵی خەرجەكان لازمە، بەڵام لە حەددی ناوەند لابدات

تەبزیر یانی چی؟ زۆر مەترسیدارە! یانی خەرجی زیادی كردن، كەهەر لازم نەبێت. واتە نیعمەت خەساركردن، نیعمەت لەناوبردن، وەك ئەوەی كە هەیە لەزۆر ماڵاندا، بەتایبەت لەكاتی دەعوەت و دەعوەتكاریدا سفرەكە ڕادەخەن ئەوە هیچ ئیسرافێ تیایە ئەوە بەجێی خۆی، زۆربەی خەڵك لەناو قاپەكەیدا زۆر خۆراكی دەمێنێتەوە كە دەیڕێژنە سەر سفرەكە، ئەمە پێی دەڵێن تەبزیر لە دیندا. واتە نیعمەت خەساركردن، ئەویش ئیتر بەشی بە بەشەریەتەوە نامێنێت، چونكە ئینسان وەختێك پێی دەڵێین ئینسان یەكێك بێت لە خەڵك، پەیوەندی لەگەڵ خەڵك بێت، چاكەو خراپەی پەیوەندی بە خەڵكەوە هەبێت، ئەگەر هاتە سەر حەددی ئیسراف، یەك مەرحەلە لە بەشەرییەت دوركەوتۆتەوە، ئەگەر هاتە سەر

**باری تەبزیر، ئیتر ئەوە دوژمنی بەشەرە، قورئان دەفەرموێ ئەوانەی وا موبەزیرن یانی نیعمەت خەسار دەکەن، ئەوانە برای شەیتانن.**